# تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە

## لە یاسای سزادانی عێراقیدا



ئارام رەحیم محەمەد

٢٠٢٠

# تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە

## لە یاسای سزادانی عێراقیدا

نووسینی

ئارام ڕەحیم محەمەد

ناوی کتێب: تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە لە یاسای سزادانی عێراقیدا

نووسەر: ئارام ڕەحیم محەممەد

پێداچوونەوە: ئاسۆ ئەحمەد

دیزاینی بەرگ: باوەڕ عەلی عەبدولکەریم

ساڵی چاپ: ٢٠٢٠ی زاینی، ٢٧٢٠ی کوردی

نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم

چاپ : چاپخانەی حەمدی

تیراژ: ٥٠٠ دانەی لێ چاپ کراوە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (١٧٥٣) ی ساڵی (٢٠٢٠) ی پێدراوە

# پەسەندكردن

ڕێزی مرۆڤ وەک مەبەست و ئامانجێکی سەرەکیی شەریعەت لە هەموو حوکم و یاسا شەرعییەکاندا ڕەنگی داوەتەوە، ئەم ڕێزو بایەخە لە ساتەوەختەکانی پێش لەدایکبوونیەوە دەست پێدەکات و تا دوای مردنیشی بەردەوام دەبێت، ئەمە ئەو بنەما گرنگە شارستانی و وجوودییەیە کە ئایەتی ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنا بني آدم﴾ پایەی بۆ دادەنێت، هەموو یاساو ڕێسا ئاسمانیی و زەمینییەکانیش بە درێژایی مێژوو لە هەوڵی ئەوەدا بوون ئەم بنەما گەردوونییە ڕەچاو بکەن و بیپارێزن.

بە تایبەت لە ڕوانگەی فەلسەفەی یاساوە هەموو تیۆرییەکانی ماف و گرێبەست و سزادان لە تەوەری دابین و جێگیرکردنی ئەم ڕێزو بایەخە مرۆییەدا هەڵ دەسووڕێن و تێکڕای تەشریعە نیشتمانی و نێونەتەوەییەکان بۆ سەلماندن و ڕەنگدانەوەیەتی.

واتە هەر کارێک و هەر ڕەفتارو هەنگاوێک لەو بەهاو بایەخە کەم بکاتەوە یان نادیدەی بگرێت و پێشێلی بکات، تەحریم و تەجریم دەکرێت و سزاو سەرکۆنەی گونجاوی بۆ دادەنرێت.

یەکێک لەو تاوان و کارە زشتانەی یاسای ئیسلام و شەریعەتە مرۆڤنەوازەکان کار بۆ ڕێگری لێکردن و نەهێشتنی دەکەن، لەباربردنی منداڵە، یان باشتر بڵێین لەباربردنی کۆرپەلەیە، بەو وردەکارییانەوە کە شرۆڤەکاران باسیان کردووە، هەرچەند لێرەو لەوێ زۆرجار دەنگگەلێکی پەرگیر بە نیازی شاراوەو ئاشکرا، هەوڵ دەدەن ڕێگای پێ بدەن و کەمپین و گەلەکۆمەی

بۆ دروست دەکەن، بەڵام دەنگە ڕەسەن و مرۆڤنەوازەکان لە بەرامبەریاندا دەوەستن و بە بەڵگەی لۆجیکی و فەلسەفی و بە پشتبەستن بە جەوهەری یاسا شەرعییەکان ڕووبەڕووی هەوڵە نەزۆکەکانیان دەبنەوە...

بێگومان بابەتەکە لە نێوان وەرگرتنی ڕەهاو ڕەتکردنەوەی ڕەهاو ڕێپێدانیی مەرجداردا وردەکاری و تەفسیلاتی زۆری هەیەو ئەوە دەهێنێت هێمنانە گفتوگۆو دیبەیتی دوورو درێژی لەسەر بکرێت. لە لایەکەوە بابەتەکە پەیوەستە بە پێگەو حورمەتی مرۆڤ و بەها ئاکارییەکان و لە لایەکی ترەوە دەچێتەوە سەر ئازادیی تاکەکەسی و چۆنێتیی ڕاگرتنی هاوسەنگی لە نێوان بەرژەوەندیی تاکەکەس و خێزان و کۆمەڵگاو ڕەنگدانەوەی ئەم هاوسەنگیڕاگرتنە لە بڕگە یاسایی و پەروەردەییەکاندا.

گرنگیی ئەم کتێبەی بەردەستمان لەوەدایە کە توێژەری خۆشەویستمان مافپەروەر (ئارام ڕەحیم محەممەد) بە ڕوانگەیەکی شەرعیی و یاسایی و پزیشکی بە ڕەچاوکردنی شیکارو لێکدانەوەی بابەتییانەی دوور لە سۆزداریی لە پرسەکەی ڕوانیوەو چووەتە ناو گەرمەی باس و خواسە شەرعی و یاسایی و جوزئییەکانیەوەو بە زمانێکی پاراوی سەردەمیانەو میتۆدێکی زانستیی بەراوردکارانەو خستنەڕوویەکی مێژوویی و قۆناغبەند بابەتەکەی ڕاڤەکردووەو گەیشتووە بە دەرنجام و ڕاسپاردەی زانستیی و گونجاو، کە بە بۆچوونی من کارێکی ناوازەو شایستەو بەهادارە.

بایی ئەوەیە ناوەندە زانستی و مەعریفییەکان و توێژەرانی یاساو شەریعەت و خوێندکارانی ئازیز، لە

ئامێزی بگرن و سوود لە شێوازو زمان و نەخشەو پلان و زانیارییەکانی وەربگرن و بەهرەمەند ببن لێی.

خوای گەورە نموونەی ئەم گەنجە خوێندەوارو توێژەرەمان بۆ زیاد بکات و گەلەکەمان لە ڕووی پێگایاندنی کەسانی لەم جۆرەوە دەوڵەمەند و پێشکەوتوو بکات.

پرۆفیسۆر دکتۆر سەباح بەرزنجی
سەرۆکی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری
سەرۆکی بەشی پەروەردەی ئیسلامی و بەراوردی ئاینەکان لە کۆلیجی زانکۆیی گۆیژە لە سلێمانی
٧ی حوزەیرانی ٢٠٢٠

# پێشەکی

لەباربردنی کۆرپەلە یەکێکە لەو تاوانانەی بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی لە تەواوی کۆمەڵگە جیاوازەکانی دنیادا بوونی هەبووەو تا ئێستایش ماوە. بێگومان ئەم تاوانە دەستدرێژیکردنە بۆ سەر ژیان و تەندروستیی کۆرپەلە پێش ئەوەی بێتە دنیاوە، سەرەڕای مردن و دروستبوونی کێشەی تەندروستی بۆ خانمانی دووگیان، لەو وڵاتانەی بە یاسا ڕێگری لە ئەنجامدانی کراوە بە شێوەیەکی نهێنی و لە بارودۆخێکی پەنهاندا، بەبێ ئاگاداری و دوور لە چاودێریی دام و دەزگا یاساییەکانی دەوڵەت، وەک زۆرێک لە تاوانەکانی دیکە ئەنجام دەدرێت. چەندین فاکتەرو پاڵنەری جیاواز وایانکردووە خەڵکی و خانمان بە تایبەتی، هەنگاو بۆ لەباربردنی کۆرپەلەکانیان هەڵ بێنن، بۆ نموونە پاڵنەری زۆربوونی ژمارەی ئەندامانی خێزان، بوونی منداڵی نەخوازراو، گیروگرفتی کۆمەڵایەتی و ئابووری.. هتد. لە کۆمەڵگەی عێراقیشدا، لەبەر ئەو هۆکارانەی سەرەوەو چەندین هۆکاری دیکەی جۆراوجۆر پەنا بۆ ئەنجامدانی دەبرێت.

جیاوازیی نێوان کۆمەڵگەکان لە جیهاندا لە ڕووە جیاوازەکانی یاسایی و ئاینی و کۆمەڵایەتی و ئاستی ئازادییەکانی تاک و بوارەکانی دیکەی ژیان، وایکردووە لە ئێستادا هەر وڵاتەو کۆمەڵگەیەک بە شێوەیەکی جیاوازو تایبەت هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەم دیاردە کۆمەڵایەتییەدا بکەن. هەندێک دەوڵەت بە شێوەیەکی یاسایی ڕێگەی بە لەباربردنی کۆرپەلە داوەو هەشیانە ڕێگریی لێ کردووە. بوونی جیاوازی لە

هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ ئەم دیاردەیەدا وایکردووە یاساناسانی هەر وڵاتەو تێڕوانینی جیاوازیان هەبێت کە هەڵقوڵاوی دنیابینیی یاسایی دەوڵەت و کۆمەڵگەکەیان بێت. بۆیە، نابینین لە ئاستی نێودەوڵەتیدا پسپۆڕانی زانستی یاسا یەک بۆچوون و تێڕوانینیان بەرانبەر بەم دیاردە کۆمەڵایەتییە هەبێت، هەر ئەمەیشە وایکردووە ببێتە جێگەی کێشمەکێشم و ڕاجیایی نێوان زۆرێک لە بیریاران و پسپۆڕانی بواری زانستی یاسا.

پاراستنی ژیان و تەندروستی مرۆڤ یەکێکە لەو بابەتە گرنگ و کرۆکییانەی لە تەواوی جیهاندا گرنگیی تەواوی پێ دەدرێت و لە دووتوێی دەقە ئاینی و یاساییەکاندا جەخت لەسەر ئەم بابەتە کراوەتەوە.

ڕوونە دەستپێکردنی بوون و دروستبوونی ئادەمیزاد لە پیتاندنی هێلکۆکەی خانمێکەوە بە تۆوی پیاوێک و جێگیربوونی بەرهەمەکەی و بەرقەراربوونیەتی لەناو منداڵدانی خانمەکەداو، دواتر دەبێت بە کۆرپەلەو، قۆناغی جیابوونەوە لە منداڵدان و لەدایکبوونی بەسەردا دێت. بەپێی تایبەتمەندیی ئەم تاوانەو لە ژێر ڕۆشنایی یاسای سزادانی عێراقی و تەواوی یاسا تایبەتمەندەکانی دیکەی وڵاتانی دنیا، دە٠٠بێت ئەو کردارە تاوانکارییەی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەی لێوە جێبەجێ دەبێت، کردارێک بێت لە بەرانبەر منداڵێک پێش قۆناغی لەدایکبوون ئەنجام بدرێت.

بەپێی ئامارەکان لە ئاستی نێودەوڵەتیدا، دەستدرێژیکردن و هەنگاوهەڵهێنان بۆ لەناوبردنی ئەم بوون یان کۆرپەلەیە، ڕۆژ بە ڕۆژ ڕوو لە هەڵکشانە. بۆ نموونە، لە کۆتا ئاماری ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی (WHO) دا ئاماژە بەوە کراوە کە لەسەر ئاستی جیهاندا لەنێوان ساڵانی ٢٠١٠ بۆ ٢٠١٤، نزیکەی ٢٥ ملیۆن

حاڵەتی لەباربردنی زیانبەخش یان ناتەندروست ئەنجام دراوە. ئەم ڕێژەیەش ٤٥%ی کۆی ئەو لەباربردنانەیە کە لەسەر ئاستی جیهان ڕوو دەدەن. بەپێی توێژینەوەیەکیش کە ڕێکخراوەکەو پەیمانگای گوتماچەر (Guttmacher Institute) ئەنجامیان داوە، دەر کەوتووە ٩٧%ی حاڵەتەکانی لەباربردن کە ئاماژەمان پێ دان لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکانی ئەفریقاو ئاسیاو ئەمریکای لاتینیدان. هەروەها لە ڕاپۆرتێکی گرنگی ڕێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتیشدا ئاماژە بەوە کراوە ساڵانە لەسەر ئاستی جیهان لە هەر چوار دووگیانبوونێکدا یەکێکیان لەبار دەبرێت.

ئاماری دیکەیش هەن کە ئاماژە بەوە دەکەن ساڵانە ٨٠ ملیۆن ئافرەت ڕووبەڕووی حاڵەتی دووگیانبوونی نەخوازراو دەبنەوە، لەوانەیش ٤٥ ملیۆنیان کۆرپەلەکانیان لەبار دەبرێن. لەباربردن کێشەی تەندروستی بۆ خانمان دروست دەکات، ساڵانە بەو هۆیەوە نیو ملیۆنیان لێ دەمرێت و ١٢٠ ملیۆن خانمیش کێشەو گیروگرفتی تەندروستییان تێدا سەر هەڵ دەدات. دووگیانبوونی نەخوازراو لە نێوان نەژادە جیاوازەکانی دنیادا بە هۆکاری کۆمەڵایەتی و ئابووری ڕوو دەدات. دووگیانبوونی نەخوازراو بە تایبەتی لەو وڵاتانەی کە بە یاسا ڕێگری لە لەباربردنی کۆرپەلە دەکرێت لە زۆرێک لە حاڵەتەکاندا لەباربردنی نایاسایی و ناتەندروستی بە دوادا دێت کە زۆر جار مردنی خانمانی دووگیانیشی لێ دەکەوێتەوە (بلیفلید، ٢٠٠٩: ١٧٧).

بە ئامانجی پێدانی زانیاریی زیاتر بە خوێنەران بەتایبەتییش ئەوانەی لە بواری یاسادا کار دەکەن، هەروەها تیشک خستنەسەر ئەو کەلێن و کەموکوڕییە یاساییانەی لە بواری تاوانی لەباربرنی کۆرپەلەوە لە

یاسای سزادانی عێراقیدا هەن و دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو بۆیان، لەبەر ئەو ئامانجانەو چەند فاکتەرێکی دیکە، بە گرنگم زانی ئەم کتێبە بخەمە بەر دیدی خوێنەران.

لە ڕێگەی شرۆڤەکردنی ئەم کردە تاوانکارییەو ئاشناکردنی هاوڵاتیان بە ڕێکارە دادوەری و سزاییەکان کە بۆ ئەنجامدەرانی دانراوە دەخوازین ڕێژەی ئەنجامدانی لە کۆمەڵگەدا کەم ببێتەوە، بە ئامانجی پاراستنی ژیانی کۆرپەلەو چاودێریکردنی تەندروستیی خانمانی دووگیان و هاندان بۆ خستنەوەی نەوەی زیاتر، چونکە بەپێی زۆرێک لە ڕاپۆرتە جیهانییە باوەڕپێکراوەکان و بۆچوونی پسپۆڕانی بوارەکانی ئابووری و گەشەسەندنی کۆمەڵگەکان لە ساڵانی پاش ٢٠٣٠ەوە پێشکەوتن و بەردەوامی لە هەموو ڕوویەکەوە بەر ئەو وڵاتانە دەکەوێت کە ژمارەی دانیشتووانیان زۆرەو دەستی کاریان تێدا فەراهەمە.

سەرەڕای بوونی چەند فەرهەنگێکی یاسایی کوردی، بەداخەوە تا ئێستایش ژمارەیەکی زۆر زاراوەی یاسایی لە زمانی عەرەبی و زمانەکانی دیکە وەر نەگێڕراون یان واتا کوردییەکەیان بۆ دەستنیشان نەکراوە، لەبەر ئەوە بە ناچاری لەم کتێبەدا وەک خۆیان دانراونەتەوە. هەروەها سەبارەت بە سوودوەرگرتن لە سەرچاوەکان، بە گرنگم زانیوە سەرەڕای سەرچاوەکانی دیکە، گرنگییەکی تایبەت بدەم بە بەکارهێنانی کتێب و سەرچاوە فارسییەکان بە تایبەتی سەرچاوە یاساییەکانیان، تا بۆچوون و دنیابینیی پسپۆڕان و شارەزایانی زانستی یاسای ناوەوەو دەرەوەی وڵاتی ئێران بگوێزمەوە ناو کتێبە یاساییەکانی خۆمان، چونکە لەم ڕووەوە کەمتر سوودیان لێ بینراوە.

له کۆتاییدا دەڵێم، مرۆڤ تا هەڵە ئەزموون نەکات، ناتوانێت بە هێڵە ڕاست و دروستەکاندا گوزەر بکات. بەم پێیە، ئەوەندەی لە توانامدا بووە بەوپەڕی دڵسۆزییەوە هەوڵم داوە ئەم کتێبە بەو زانستە کەمەی هەمە، زۆرترین زانیاری و دەوڵەمەندترین سەرچاوەی تێدا بەکار بهێنم، و بە زمانێک بینووسم ئەوانەی پاشخانی یاساییان هەیەو ئەوانەیش کە ئەو پاشخانەیان نییە لێی تێ بگەن، تا بە شێوەی کتێبێکی پڕ لە زانیاری، خوێنەری کورد زۆرترین سوودی لێ وەربگریت و، خوانەخواستە پەشیمان نەبێت لە خوێندنەوەی. گومانی تێدا نییە ئەوەی زادەی دەستی ئادەمیزاد بێت، بەدەر نابێت لە کەموکوڕی و، ئەوە تەنیا خودایە کە سەرجەمی کارو فەرمانەکانی پاک و بێخەوشن، بەندەیش بە دڵنیاییەوە لە وێستگەکانی ئامادەکرن و نووسینەوەی ئەم کتێبەدا ڕووبەڕووی هەڵەو کەموکوڕیی جیاواز بوومەتەوە، بۆیە داواکارم بمبەخشن لە هەر جۆرە ئاستەنگ و هەڵەیەک کە بیرو هزری بەڕێزتانی پێوە ماندوو ببێت.

# بەشی یەکەم

## خوێندنەوەیەکی گشتگیر بۆ زاراوەی لەباربردنی کۆرپەلە

سەرەتا لەم بەشەدا سەرنجی خوێنەران ڕا دەکێشین بۆ شرۆڤەکردنێکی گشتگیر سەبارەت بە لەباربردنی کۆرپەلە لە ڕوانگەی چەمک، جۆر، جیاوازی لەباربردنی کۆرپەلە لەگەڵ ناونیشانە لەیەکچووەکانیدا، پێشینە، بنەمای لەباربردنی کۆرپەلە هەروەها ئەو تیۆرییانەی سەبارەت بەم بابەتە خراونەتە ڕوو، لە کۆتایی ئەم بەشەشدا لەباربردنی کۆرپەلە لە شەریعەتی ئیسلامیدا گەنگەشە دەکەین.

### چەمکی لەباربردنی کۆرپەلە

دەوترێت: پێناسەکردنی هەر شتێک بەشێکە لە وێناکردنی. چەمکی (لەباربردنی کۆرپەلە) یش لە چەند ڕوانگەیەکی جیاوازەوە خوێندنەوەو پێناسەی جیاوازی بۆ ئەنجام دراوە، بۆنمونە هەر پسپۆڕێکی یاسایی بۆ خۆی هاتووە بە شێوەیەکی تایبەت ئاماژەیەکی جیاوازی بۆ کردووە، لەبەر ئەوەو بۆ زیاتر ئاشنابوون بەم چەمکە بە پێویستی دەزانین چەمکی لەباربردنی کۆرپەلە لە ڕوانگەی زمانەوانی، زاراوەیی و فیقهییەوە پێناسە بکەین.

## چەمکی لەباربردنی کۆرپەلە لە ڕوانگەی زمانەوانییەوە

(جنین)، کە لەزمانەکانی عەرەبی و فارسیدا بەرانبەر بە (کۆرپەلە) بەکار دەبرێت، لە ڕەگی (جنن) ەوە وەر گیراوەو، کە لە ڕوانگەی زمانەوانییەوە بە هەر شتێک دەوترێت نادیارو داپۆشراو بێت، بۆ منداڵیش کاتێک کە لە ناو منداڵدانی دایکیدایە بەکار دەهێنرێت (رزم ساز، ١٣٧٩: ٢٩). لە زاراوەی فیقهی و زانستی تاواندا بە هەمان مانا دێت. سەرەتای ژیانی کۆرپەلە بە پیتاندنی هێلکەی ئافرەت لە منداڵدانی ئافرەتدا بەهۆی تۆوی پیاوەوە دەست پێ دەکات و تا هاتنە دنیای هەر پێی دەوترێت کۆرپەلە (پاد، ١٣٦٨: ٦٧). بە شێوەیەکی گشتی، منداڵ تا کاتێک لە ناو منداڵدانی دایکیدا بێت و هێشتا لەدایک نەبووبێت بە کۆرپەلە ئەژمار دەکرێت (مهدی سودمند، ١٣٦٨: ٥). (سقط) یان (إجهاض) لە ڕووی زمانەوانییەوە بە هەمان شێوە بە مانای (کەوتنەخوارەوە) یا (لەدەستچوون) دێت.

لەباربردنی کۆرپەلە بە مانای جیاکردنەوەی دێت لە منداڵدانی دایکی پێش ئەوەی ماوەی مانەوەی تەواو بووبێت، و بەبێ بوونی هیچ پێویستی یان ناچاربوونێک (مفتاح محمد اقزيت، ٢٠٠٦: ٢١٣).

(إجهاض) کە لە زمانی عەرەبیدا بە مانای لەباربردن دێت، چەندین وشەی هاوواتای هەیە، بە هەمان شێوە لە ئەکادیمیای زمانی عەرەبی وشەی (إجهاض) بۆ لەباربردنی کۆرپەلەیەک کە لە مانگی چوارەمی ژیانیدا تا مانگی حەوتەمی سکپڕی بێت بەکار دەهێنێت. لە کۆمەڵگەی کوردەواری خۆشماندا، خانمێک کاتێک کۆرپەلەیەکی لەباردەچێت، چەمکی (منداڵ خستن)ی بۆ بەکار دەهێنرێت.

## لەباربردنی کۆرپەلە لە ڕوانگەی زاراوەی زانایانەوە

پاش ئەوەی مانای زمانەوانی لەباربردنی کۆرپەلەمان شرۆڤەکرد، ئێستاش واتاکەی لە زاراوەسازیی فیقهی و پزیشکی و یاساییەوە دەخەینە ڕوو.

### لەباربردنی کۆرپەلە لە ڕوانگەی فیقهییەوە

(لەبارچوونی کۆرپەلە) لە ڕوانگەی فیقهییەوە بە دەرچوونی کۆرپەلە لە منداڵدانی دایکیەوە پێش کاتی سروشتیی دیارکراوی خۆی، یان بۆ ئەو کۆرپەلانەی لە کاتی لەدایکبوونیاندا یەکێک لە ئەندامەکانیان کەموکوڕی تێدابێت، بەکار هاتووە. سەرەڕای ئەمەش زانایان لەبارچوونی کۆرپەلەیەک کە بە هۆی کرداری کەسێکەوە (لەباربردن) ڕووی دابێت، یان بەبێ بوونی هیچ کردارێکی تاوانکاری واتە سەربەخۆ ڕووی دابێت (لەبارچوون)، جیاوازییان کردووە. لە حاڵەتی **یەکەمیاندا**، واتە ئەگەر لە ئەنجامی کردارێکی تاوانکاریدا ڕووی دابێت، ئەوا بە تاوان ئەژماریان کردووەو سزای گونجاویان بۆ دیار کردووە، بە بەراورد بە حاڵەتی **دووەم** کە هیچ جۆرە سزایەکیان بۆ دەستنیشان نەکردووە. لە شوێنی وشەی لەباربردن زاراوەی هاوواتای بەکار هێنراوە لەوانە (إسقاط، إملاص، إلقاء، طرح) (الرازي، ١٩٨٨: ٤٣٧).

زانایانی ئەهلی سوننەت سەبارەت بە واتاو ڕاڤەی لەباربردنی کۆرپەلە لە ڕوانگەی زاراوەییەوە، بە واتای هاتنەدەرەوەی کۆرپەلە لە سکی دایکیدا جا بە زیندوویی بێت یان بە مردوویی بە مەرجێک پێش کاتی سروشتی لەدایکبوون بێت، پێناسە دەکەن. بە واتایەکی دیکە، ئەگەر کۆرپەلەیەک پێش تەواوبوونی کاتی سروشتیی لەدایکبوون و دروستبوونی تەواوی ئەندامەکانی

جەستەی، بە مردوویی لە منداڵدانی دایکی هاتە دەرەوە، بەو جۆرە لەدایکبوونە دەوترێت (لەبارچوون). بۆچوونی موفتیی ئەزهەر ئەوەیە کە لەباربردنی کۆرپەلە بریتییە لە هاتنەدەرەوەی کۆرپەلە لە منداڵدانی دایکیدا پێش تەواوکردنی ماوەی سروشتیی مانەوەی (لە پێگەی www.jameataleman.org وەر گیراوە).

دکتۆر یوسف قەرەزاوی سەرۆکی یەکێتیی جیهانیی زانایانی مسوڵمان سەبارەت بە واتاو ڕاڤەی لەباربردنی کۆرپەلە لە ڕوانگەی زاراوەییەوە، دەڵێت: ئەگەر خانمێک دووگیان بێت و پێش تەواوکردنی ماوەی سکپڕیی بە شێوەیەکی ئەنقەست ویستی لەباربردنی هەبێت، جا ئەو ویستە چ بە ویستی خودی خانمەکە بێت یان بە ویستی کەسێکی دیکە، پێی دەوترێت (لەباربردنی کۆرپەلە).

لە ڕوانگەی زاراوەییەوە لەباربردنی کۆرپەلە بریتییە لە کۆتاییهێنانی سکپڕی بە کۆرپەلە پێش هاتنی کاتی سروشتیی لەدایکبوون و هاتنەدەرەوەی لە منداڵدانی دایکی، جا چ بە مردوویی بێت یان بە زیندوویی، بێ ئەوی توانای درێژەدانی بە ژیان هەبێت، جا هۆکارەکەی خودی خانمەکە بێت، وەک ئەوەی حەب یان دەرزی بەکار بهێنێت، یان کاری کەسێکی تر بێت (التویجري، ٢٠١٦: ٩٢٣).

وەک پێشتر ڕوونمان کردەوە پێناسەی لەباربردنی کۆرپەلە لە ڕوانگەی زمانەوانییەوە بریتییە لە کەوتنەخوارەوە، لەدەستچوون، خستن... هتد، بە سەرنجدان لە ناساندنی لەباربردنی کۆرپەلە لە ڕوانگەی زمانەوانی و زاراوەییەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە لەباربردنی کۆرپەلە لەم ڕووانەوە بە ئەندازەیەکی فراوان جیاوازییان نییەو زۆر لە یەکەوە نزیکن، جگە لەوەی لە ڕوانگەی زمانەوانییەوە زیاتر واتایەکی گشتیی

هەیە، بەڵام لە ڕوانگەی فیقهییەوە تەنیا بە واتای لەباربردن کۆرپەلە بەکار دەهێنرێت.

بە شێوەیەکی گشتی بۆچوونی زانایانی شەریعەتی ئیسلامی سەبارەت بە ڕاقەی لەباربردنی کۆرپەلە ئەوەیە کە بە لەدەستچوونی کۆرپەلەیەک دێت پێش هەفتەی بیست و هەشتەمی دووگیانی، کە لە زۆربەی کاتدا کۆرپەلە لە دەرەوەی منداڵدانی دایکیدا توانای درێژەدان بە ژیانی نەبێت (إبن عابدین، بێ ساڵی چاپ).

### لەباربردنی کۆرپەلە لە ڕوانگەی پزیشکییەوە

لە فەرهەنگی زاراوە پزیشکییەکاندا، لەباربردن بریتییە لە دەرچوونی بەرهەمی دووگیانی پێش تەواوکردنی سووڕی دووگیانی بەبێ ئەوەی کۆرپەلە توانای درێژەدانی بە ژیانێکی سەربەخۆی هەبێت، چونکە کۆرپەلە پێش ئەوەی بگات بە تەمەنی شەش مانگ لە سکی دایکیدا توانای درێژەدان بە ژیانی لە دەرەوە نییە. لەبەر ئەوە ئەگەر هات و پێش تەمەنی شەش مانگی لە سکی دایکی هاتە دەرەوە ئەوا بە لەبارچوو ئەژمار دەکرێت و، ئەگەر کۆرپەلە پاش شەش مانگی هاتە دنیاوە، هەرچەندە توانای ژیانیشی هەبێت، بەڵام ئەم توانایە بۆ ماوەیەکی کورتەو دەرفەتی درێژدان بە ژیانی کەمترە بە هۆکاری ناکاملبوونی و، زۆربەی جار لەباربردن پێش هەفتەی دوازدەهەمی دووگیانی ئەنجام دەدرێت (لە پێگەی www.sehha.com وەرگیراوە).

دەتوانرێت لەباربردنی کۆرپەلە لە ڕوانگەی پزیشکییەوە بناسێنرێت بەوەی بریتییە لە هاتنەدەرەوەی کۆرپەلە لە منداڵدانی دایکی پێش تەواوکردنی هەفتەی بیست و هەشتەمی دووگیانی، بەڵام پاش ئەو ماوەیە بە لەدایکبوونی پێشوەختە دا دەنرێت (کلای تۆن، ١٩٨٠:

١٣٣). هەروەها لەباربردنی کۆرپەلە لە دیدگای پزیشکییەوە بریتییە لە کردنەدەرەوەی کۆرپەلە بە شێوەیەکی ئەنقەست، یان خۆبەخۆ یان بە شێوەی دەستکرد، پێش کاتی سروشتیی خۆی و، پێش هەفتەی بیستەم، کە کۆرپەلەکە توانای ژیانی نەبێت (هکر، ١٣٨٤ :٣٥٧). ڕێکخراوی تەندوستیی جیهانی لەباربردنی کۆرپەلە بەم شێوەیە دەناسێنێت کە بریتییە لە وەستاندنی حاڵەتی دووگیانیی ئافرەت، جا بە شێوەی خۆبەخۆیی بێت یان بە شێوەیەکی ئەنقەست لە یەکەم ڕۆژی دووگیانییەوە تا هەفتەی بیستەم (محقق داماد، ١٣٧٣: ٤١).

بۆچوونی دکتۆر وەسفی محەمەد عەلی سەبارەت بە لەباربردنی کۆرپەلە لە ڕوانگەی پزیشکییەوە ئەوەیە کە:

١- **خستن (الإسقاط):** بەتاڵکردنەوەی منداڵدانی دایکە لە کۆرپەلە، لە سێ مانگی یەکەمی دووگیانییدا.

٢- **لەباربردنی کۆرپەلە (إجهاض الجنين):** بەتاڵکردنەوەی منداڵدانی دایکە لە کۆرپەلە، کە تەمەنی دووگیانییەکەی زیاتر بێت لە سێ مانگ و کەمتر بێت لە شەش مانگ.

٣- **لەدایکبوونی پێش وەختە (الولادة المبكرة):** خاڵیکردنەوەی منداڵدانی دایکە لە کۆرپەلە لە سەرەتای مانگی حەوتەمی دووگیانییەوە تا پێش تەواوکردنی ماوەی سروشتیی سکپڕی (وصفي محمد علي، ١٩٧٠: ٤٠٦).

هەروەها لە ڕوانگەی زاراوەی پزیشکیی شەرعییەوە بریتییە لە کۆتاییهێنان بە حاڵەتی دووگیانیی خانمێک پێش کاتی سروشتیی لەدایکبوون، جا لە هەر قۆناغێک لە قۆناغەکانیدا بێت (لويس شمعان، ١٩٧٣: ١٧٢).

یاساناسان لەسەر پێناسەیەکی یەکگرتوو بۆ لەباربردنی کۆرپەلە هاوڕا نین. یاسادانەران و پسپۆڕانی یاسایی هەر وڵاتێک، لە ژێر ڕۆشنایی و چۆنێتیی دارشتنی زانستی سزاو دانانی یاسای سزادانی ناوخۆی وڵاتانیان دێن لەباربردنی کۆرپەلە دەناسێنن و گەنگەشەی دەکەن. لە ئێستادا پێناسەیەکی دیارکراوو گشتگیر سەبارەت بە لەباربردنی کۆرپەلە لە یاسای سزادانی عێراقیدا بوونی نییە، بەڵکو یاسادانەری عێراقی ئەم بابەتەی بۆ دادگاکان و فیقه بەجێ هێشتووە، تا بەپێی کات و چۆنێتیی ڕوودانی تاوانەکە ناساندن و بەرگێکی گونجاوی یاسایی، لەژێر ڕۆشنایی ماددەکانی تایبەت بەم تاوانە لە یاسای سزاداندا بەبەردا بکرێت. بۆیە بە تەماشاکردنی برگە یاساییەکانی یاسای سزادانی عێراقی تایبەت بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە دەتوانین چەند پێناسەیەکی یاسایی بۆ ئەم تاوانە بخەینە ڕوو:

هەنگاونان بۆ دەرهێنانێکی ناسروشتیی کۆرپەلە، پێش کاتی سروشتیی لەدایکبوون، بە شێوەیەکی ئەنقەست و بەبێ بوونی هیچ جۆرە ناچاربوونێک، بە هەر ئامرازێکیش بێت (ضاري خليل محمود، ١٩٧٧: ٣٥٦). یان کۆتاییهێنانە بە حاڵەتی دووگیانی پێش کاتی سروشتیی خۆی (فوزية عبد الستار، ١٩٨٢: ٤٩١).

یان ئەنجامدانی هەر جۆرە کردارێکی تاوانکارییە کە ببێتە هۆی ڕاگرتنی نەشونمای کۆرپەلەو هێنانەدەرەوەی پێش کاتی سروشتیی لەدایکبوونی.

پرۆفیسۆر گارو لەم بارەیەوە دەڵێت: هێنانەدەرەوەی کۆرپەلەیە پێش کاتی سروشتیی لەدایکبوون. گارسویش کە یەکێکە لە یاساناسەکانی فەرەنسا دەڵێت:

کردنەدەرەوەی کۆرپەلەیە پێش کاتی سروشتیی لەدایکبوون.

زانای گەورەی کورد پرۆفیسۆر مستەفا زەڵمی لە پێناسەی لەباربردنی کۆرپەلەوە دەڵێت: ڕاگرتنی سووڕی سروشتیی دووگیانیە، کە دەبێتە هۆی لە دەستدانی کۆرپەلە (مصطفی إبراهیم الزلمي، ٢٠١١: ٨).

بە شێوەیەکی گشتی لە یەک پێناسەی گشتگیری یاساییدا دەتوانرێت بوترێت: لەباربردنی کۆرپەلە بریتییە لە هێنانەدەرەوەی کۆرپەلە یان یان کۆتاهێنانی سکپڕی لە خۆڕا یان بە بوونی پاڵنەرێک، بە ئاگایی و بە مەبەستی لەباربردنی، بەبێ بوونی مۆڵەتی یاسایی.

## جۆرەکانی لەباربردنی کۆرپەلەو جیاوازیکردنی لەگەڵ ناونیشانە لەیەکچووەکانیدا

پاش ئەوەی لەباربردنی کۆرپەلەمان لە ڕوانگەی زمانەوانی و زاراوەییەوە ناساند، لەم بەشەدا جۆرەکانی لەباربردنی کۆرپەلەو جیاوازیکردنی لەگەڵ ناونیشانە لێکچووەکانیدا دەخەینە ڕوو.

### جۆرەکانی لەباربردنی کۆرپەلە

سەبارەت بە جۆرەکانی لەباربردنی کۆرپەلە، بۆچوونی جیاواز لە نێوان یاساناساندا هەیە، هەر یاساناسێک و بەپێی بۆچوون و ئەو چوارچێوەو ژینگە یاساییەی تێیدایە هاتووە لەباربردنی کۆرپەلەی بۆ چەند جۆرێک پۆلێن کردووە. بۆیە بە شیوەیەکی گشتی چەند جۆرێکی دەخەینە ڕوو.

یەکەم: لەبارچوونی ئاسایی

لەبارچوونی ئاسایی، (لەبارچوونی سروشتی) یشی پێ دەوترێت، ئەوەیە کە بەبێ خواستی ژن و مێرد یان ئافرەتی دووگیان، یان هەر کەسێکی دیکە، بە هۆکاری ئەو نەخۆشییانەی دووچاری خانمەکە یان کۆرپەلەکە دەبنەوە، بەبێ ئەوەی هیچ کەسێک لەم کردەیەدا دەستتێوەردانی هەبێت، ڕوو دەدات. لەم جۆرەدا هیچ جۆرە پابەندبوونێک یان بەرپرسیارێتییەکی یاسایی ڕووبەڕووی خانمەکە یان هیچ کەسێکی دیکە نابێتەوە. ئەو پزیشکانەی لەم بوارەدا پسپۆڕن پێیان وایە ڕێژەیەکی زۆری ئەو کۆرپەلانەی لەبار دەچن، ئەوانەن کە شێواون (مُشَوَّه) (واتە ئەو کۆرپەلانەی لە ڕووی جەستەییەوە ناتەواون) (شحاتة عبد المطلب حسن أحمد، بە وەرگرتن لە جدوی محمد أمين، ٢٠١٠: ٢٩). هەروەها ڕێژەی ١٠%ی لەبارچوونی کۆرپەلە بە هۆی ئەو نەخۆشییانەوەیە کە ڕووبەڕووی خۆیان یان خانمانی دووگیان دەبێتەوە (الغمري، ٢٠٠٥: ١٥٠).

دووەم: لەباربردن بە دەرمان

چەشنێکی دیکە لە چەشنەکانی لەباربردنی کۆرپەلە، لەباربردنی بە دەرمان یان لەباربردنی پزیشکی یاخود یاساییە.

بە شێوەیەکی گشتی بەیەکگەیشتن و کۆبوونەوەی نێرو مێیەک و گرێدانی گرێبەندی هاوسەرێتیی نێوانیان وەک هۆکارێکی ڕاستەوخۆی دروستبوونی کۆرپەلە، فاکتەری بەردەوامبوونی وەچەی مرۆڤایەتی و بەردەوامبوونی ژیان و جێگیربوونی باری دەروونیی هەردوو لایانە، ئەمەیش لە چوارچێوەی پەیکەری خێزاندا فەراهەم دەبێت. بەڵام هەندێک جار ڕوو دەدات

هاتنەدنیای منداڵێک ببێتە مایەی دروستکردنی مەترسی بۆ سەر تەندروستیی خانمەکە. لەباربردنی کۆرپەلە لەم حاڵەتەدا لە زۆرێک لە یاساکانی وڵاتانی دنیا، بگرە لە ئاینە جیاوازەکانیشدا، ڕێکخستنی تایبەتی بۆ کراوەو ڕێکاری گونجاوی بۆ گیراوەتە بەر، بە شێوەیەک ئەو مەترسییەی بۆ سەر خانمە دووگیانەکەو کۆرپەلەکەو خێزانەکەشی دروست دەبێت نەمێنێت و، لە ئەنجامدا کۆمەڵگەیش لە کێشەی جۆراوجۆر دوور دەکەوێتەوەو لە کەشێکی ئارامدا دەمێنێتەوە.

لەباربردن بە دەرمان لەباربردنێکە کە لایەنێکی دەرمانی واتە پزیشکیی هەیەو، بە شێوەیەکی گشتی بە پرس و ڕاوێژکردن بە پزیشک و شارەزایانی پزیشکی یاسایی و ڕەزامەندیی لایەنە یاساییە فەرمییەکان ئەنجام دەدرێت (عباسی، بە وەرگرتن لە سوهانیان، ١٣٨٩: ٥١).

ئەم جۆرەی لەباربردن لە کاتێکدا بەرجەستە دەبێت کە بەردەوامبوونی حاڵەتە دووگیانییەکە بۆ خانمەکە مەترسیدار بێت و گیانی خانمەکە بە هۆکاری وەک نەخۆشی...، لە مەترسیدا قەرار بگرێت. بۆیە لەم چەشنە بارودۆخانەدا بڕیاری ڕاگرتن یان کۆتاپێهێنانی حاڵەتی دووگیانیەکە دەدرێت، بە مەبەستی دانانی بەربەستێک بەرانبەر بەو مەترسییە جەستەیی و دەروونییانەی ڕووبەڕووی خانمەکە دەبنەوە، هەروەها لە هەندێک حاڵەتدا لە ژێر ناونیشانی پێویستی بۆ ڕزگارکردنی ژیانی خانمەکە دەخرێتە ڕوو.

**بە شێوەیەکی گشتی سەبارەت بە لەباربردن بە دەرمان، پێویستە چەند مەرجێك هەبێت:**

١. پێویستە ژیانی خانمە دووگیانەکە لە مەترسیدا بێت، ئەم مەترسییەیش لەلایەن لیژنەیەکی پزیشکییەوە پشتڕاست کرابێتەوە.
٢. پێویستە ئەو مەترسییە پزیشکییە، بە هۆکاری بوونی کۆرپەلەکە یان مانەوەی کۆرپەلەکەوە بێت لە ناو منداڵدانی دایکیدا.
٣. هیچ ڕێگەچارەیەکی دیکە پێ شک نەیەت، جگە لە لەباربردنی کۆرپەلەکە.
٤. ئەنجامدانی کاری لەباربردنەکە پێویستە لە ژێر چاودێریی پزیشکانی تایبەتمەندو لە نەخۆشخانەیەکدا ئەنجام بدرێت کە هەموو جۆرە پێداویستییەکی بۆ ئەو کارە تێدا بێت (مصطفى إبراهيم الزلمي، ٢٠١١: ١٠).

شایەنی ئاماژەپێدانە کە ماددەیەکی تایبەت سەبارەت بە لەباربردن بە دەرمان لە یاسای سزادانی عیراقی یان هیچ یاسایەکی دیکەی تایبەتدا لە عێراقدا بوونی نییە، ئەمەیش یەکێکە لەو ڕەخنە زەقانەی سەبارەت بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە لە یاسای تاوانی یان سزادانی عێراق دەگیرێت. بەڵام بۆ پڕکردنەوەی ئەم کەلێنە دەتوانرێت سوود لە ماددەی ٦٣[1]ی یاسای سزادانی

---

[1] لێپرسینەوەی سزایی لەگەڵ کەسێکدا ناکرێت کە تاوانێکی کردبێت ئەویش بۆ پاراستنی خودی خۆی یان کەسێکی تر یاخود دارایی کەسێکی تر لە مەترسییەکی گەورە کە خۆی مەبەستی نەبووە بە ئەنقەست بیکات و، لە توانای ئەودا نەبووە ڕێگری بکات بە هەر هۆیەک بێت و بە مەرجێک دەبێت کارەکە پێک هاتبێت بۆ تاوانێکی گونجاو بۆ ئەو مەترسییە کە ویستراوە خۆی لێ بپارێزێت و دانانرێت لەو حاڵەتەدا بە ناچاربوون یاسا ڕێگەی پێ دابێت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو مەترسییە.

عێراقی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩ وەر بگیرێت، ئەویش ئەوەیە کە لە حاڵەتی بوونی بارودۆخێکی پێویستدا کە بەردەوامیی حاڵەتی دووگیانی مەترسیدار بێت بۆ سەر ژیانی خانمە دووگیانەکە، دەتوانرێت ئەم ماددەیە بخرێتە کارو لە کۆتاییشدا سەبارەت بە پابەندنەبوونی یاساییەوە سوود وەر بگرین.

هەروەها دەتوانرێت سوود لە ڕێنماییەکانی وەزارەتی تەندروستیی عێراقی کە لە ساڵی ١٩٥٨ دەرچوون وەر بگیرێت، کە تێیدا هاتووە: لە حاڵەتی بوونی مەترسی و لێکەوتەی تەندروستی بۆ سەر گیانی خانمی دووگیان بە هۆکاری بوونی کۆرپەلەکەی سکیدا، دوای ئەوەی نووسراوی فەرمیی تەندروستی لەم بارەیەوە دەر دەچێت و ڕەزامەندیی سێ پزیشکی تایبەتمەند وەر دەگیرێت بەوەی بەردەوامیی حاڵەتی دووگیانی بۆ خانمەکە مەترسیدارە، مۆڵەتی لەباربردن دەردەچێت و، بەدەر لەم حاڵەتە، پزیشکی تایبەتمەند یان ئەو کەسەی بە ئەنجامدانی لەباربردنێک هەڵ دەستێت ڕووبەڕووی بەرپرسیارێتیی یاسایی دەبێتەوە (همداد محمد صابر، ٢٠١٠: ٢٦).

سێیەم: لەباربردنی بە لێدان (زەبر)

ئەم جۆرەش لە لەباربردن شێوەیەکی ترە لەو شێوازانەی بە شێوەیەکی بەرفراوان ڕوو دەدات. لەباربردنێکە لە ئەنجامی کێشەو ڕووداوە جۆربەجۆرەکاندا ڕوو دەدات، کە کردارەکەی بە شێوەیەکی ڕەها بە ڕێککەوت ڕوو دەدات و بکەرەکەی هیچ ویستێکی تاوانکاریی نییە، وەک ئەوەی لە ڕووداوەکانی هاتوچۆو هاوشێوەکانی ڕوو دەدات.

لەباربردنی تاوانی لەباربردنێکە بە شێوەیەکی ئەنقەست و بە مەبەستی کۆتایی پێهێنانی حاڵەتێکی دووگیانی و ڕاگرتن و پچڕاندنی خولی دووگیانیی خانمەکەو دەرهێنانی کۆرپەلەکە بە پشتبەستن بە ئامرازی جۆراوجۆر، وەک کەلوپەلی پزیشکی، ئەنجام دەدرێت. جا ئەو کارە لەلایەن خودی خانمەکەوە ئەنجام بدرێت یاخود لەلایەن کەسێکی دیکەوە بە ڕەزامەندیی خانمەکە یان بەبێ ڕەزامەندیی. ئەم جۆرە لە لەباربردن هەم لە ڕوانگەی یاساییەوەو هەم لە ڕوانگەی شەرعییشەوە تاوانەو بکەرەکەی ڕووبەڕووی سزا دەبێتەوە.

هەروەها دەتوانرێت بوترێت لەباربردنی تاوانی لەباربردنێکە کە بە ئامانجی ڕزگاربوون لە کۆرپەلەو بەبێ بوونی هیچ پاساوێکی یاسایی، بە هەر ئامرازێک بێت، ئەنجام دەدرێت (مصطفى إبراهيم الزلمي، ٢٠١٣: ١٨٢).

**بە شێوەیەکی گشتی بۆ هاتنەدیی لەباربردنی تاوانی پێویستە چەند مەرجێك تێبینی بکرێن:**

١. کرداری هێنانە دەرەوەی کۆرپەلەکە، پێش کاتی سروشتیی لەدایکبوون بێت.
٢. ئەم کردارە پێویستە لەلایەن بکەرەکەیەوە بە سوودوەرگرتن لە ئامراز یان پێداویستی دروستکراو یان کردارێکی فیزیکی، لەلایەن خودی بکەرەکەوە شێوە بگرێت.
٣. ویستی تاوانکاری، پێویستە بکەری لەباربردنەکە ویستی خراپ بێت و ئامانجی لەباربردنی کۆرپەلەکە بێت.

## جیاوازیی لەباربردنی کۆرپەلە لەگەڵ ناونیشانە لەیەکچووەکانیدا

پاش ئەوەی چەمکی لەباربردنی کۆرپەلەمان لە ڕوانگەی زمانەوانی و زاراوەییەوە خستە ڕووو باسمان لە شێوەکانی کرد، بە پێویستی دەزانین لەم بەشەدا جیاوازیی لەباربردنی کۆرپەلە لەگەڵ ناونیشانە لەیەکچووەکانیدا شرۆڤە بکەین:

### یەکەم: لەباربردنی کۆرپەلە لەگەڵ دانانی سک پێش کاتی لەدایکبوون

دانانی سک پێش کاتی لەدایکبوون, لەدایکبوونی کۆرپەلەیە، پێش ئەوەی ئەندامەکانی بەتەواوی دروست بووبن. بە واتایەکی دیکە، پێش تەواوبوونی ئەو ماوەیەی کۆرپەلەیەکی ئاسایی پێویستیەتی لە ناو سکی دایکیدا تەواوی بکات کە نۆ مانگی تەواوە. چەند فاکتەرێک ڕێخۆشکەرن و دەبنە هۆی ڕاستەوخۆ بۆ دانانی سک پێش کاتی لەدایکبوون، بۆ نموونە:

١. باوترین هۆکار، ناجێگیریی باری تەندروستیی دایک یان کۆرپەلەکە.
٢. ئەگەر هات و منداڵدانی خانمەکە دووچاری هەوکردن بووبێتەوە.
٣. ئەگەر هات و گەشەی کۆرپەلەکە وەستابوو.
٤. ئەگەر هات و هیچ شلەمەنییەک لە ناو کیسەی ئامنیوتیک نەمێنێت، و کۆرپەلەکە لە کەشێکی وشکدا مابێتەوە.
٥. ئەو لەباربردنانەی خانمەکە پێشتر پێی هەستابێت و، بووبێتە هۆی لاوازبوونی منداڵدانی خانمەکە.

٦. ئەنجامدانی کاری زیادی ڕۆژانەو سەفەرکردنی دوورو درێژو ئەنجامدانی جموجۆڵی زیاد لە پێویستی خانمەکە لە ماڵ یان لەسەر کارەکەی (لە سایتی www.falntyna.com وەرگیراوە).

بە شێوەیەکی گشتی دانانی سک پێش کاتی خۆی، لە نێوان مانگی حەوتەم بۆ مانگی هەشتەم، واتە لەنێوان هەفتەی بیست و شەشەم تا هەفتەی سی و پێنجەم، ڕوو دەدات. ئەگەر هات و پێش مانگی حەوتەم بێت ئەو کاتە دەبێتە لەبارچوونی کۆرپەلە، چونکە توانای ئەوەی نابێت بەردەوامی بە ژیان بدات.

دووەم: لەباربردنی کۆرپەلە لەگەڵ کوشتنی ئەنقەست

ئاشکرایە تا ئەو کاتەی منداڵ لە ناو سکی دایکیدا بێت و هێشتا لەدایک نەبووبێت بە کۆرپەلە دەناسێنرێت و تەواوی ئەو ماف و بنەما یاساییە تایبەتانەی هەن لە بەرانبەریدا ئیجرا دەکرێن. هەروەها هیچ ڕاجیاییەک نییە کاتێک کۆرپەلە دێتە دنیاو لە منداڵدانی دایکی جیا دەبێتەوە، ئەو کاتە وەک مرۆڤێکی زیندوو هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرێت و بە لەبەرچاوگرتنی تەمەن و بارە یاساییەکەی تەواوی ئەو ماف و بنەما یاساییانەی بەسەر مرۆڤێکی ئاساییدا جێبەجێ دەکرێت بە هەمان شێوە بەرانبەر ئەم منداڵە تازە لەدایکبووەش ڕەچاو دەکرێن. لەبەر ئەوە کۆتایی هاتنی قۆناغی کۆرپەلەیی و دەستپێکردنی قۆناغی مرۆڤی تەواو، بە سنووری نێوان تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەو کوشتنی ئەنقەست دیار دەکرێت.

بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین گرنگترین جیاوازییەکانی نێوان هەر دوو تاوانی لەباربردنی

کۆرپەلەو کوشتنی ئەنقەست لەم خاڵانەی خوارەوە گەنگەشە بکەین:

١. لەباربردنی کۆرپەلە لەگەڵ کوشتنی ئەنقەست جیاواز دەبێت لەوەدا کە تاوانلێکراو لە کوشتنی ئەنقەستدا مرۆڤێکی زیندووە، بەڵام لە لەباربردنی کۆرپەلەدا خودی کۆرپەلەکەیەو ناوەندی پشتیوانە یاساییەکەی بریتییە لە ئامانجی لەدەستنەدانی کۆرپەلەکە پێش تەواوبوونی ماوەی سروشتیی خۆی کە لەدایکبوونیەتی لە کاتی ئاسایی خۆیدا. بەڵام لە تاوانی کوشتنی ئەنقەستدا بەو چەشنە نییە، بەڵکو ئامانج بریتییە لە پشتیوانیکردن لە مرۆڤێکی زیندوو. ئاشکراشە کە پشتیوانیی یاسایی لە مرۆڤێکی زیندوو چوارچێوەیەکی فراوانترو گەورەتری هەیە لە چاو ئەوەی هێشتا کۆرپەلە بێت، وەک سەلامەتیی جەستەیی یان دەروونی... هتد، لە کاتێکدا ئەگەر کۆرپەلە بێت زیاتر ئامانج لە پاراستنە یاساییەکەی پاراستنی مافی ژیانیەتی تا ئەو کاتەی لەدایک دەبێت.

٢. یاسادانەری عێراقی بکەری سزای یاسایی بۆ تاوانی کوشتن، جا ئەنقەست بێت یان نائەنقەست، دیار کردووە. بەڵام لە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەدا یاسادانەری عێراقی و زۆرێک لە یاسای وڵاتە جیاوازەکانی دیکە، بکەری تاوانەکە تەنیا لە حاڵەتی ئەنقەستدا سزا دەدات. هەروەها ڕێژەی ئەو سزایەی بۆ تاوانی ئەنقەست دیار کراوە زیاترو فراوانترە لە چاو تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە.

٣. بەدەر لەوەی یاسا پارێزگاری لە کۆرپەلەو مرۆڤێکی زیندوو دەکات، بەڵام لە کاتێکدا ئەگەر هات و مانەوەی ئەم کۆرپەلەیە لە منداڵدانی دایکیدا ببێتە هۆکاری زیانگەیاندن و دروستکردنی هەڕەشە بۆ سەر تەندروستی و ژیانی خانمە دووگیانەکە، لەم حاڵەتەدا یاسا ژیانی خانمە دووگیانە پێش دەخات لە بەرانبەر کۆرپەلەکەدا. بە پشتبەستن بە بنەمای (لاَ ضَرَرَ)، لەو بابەتانەی مانەوەی کۆرپەلەکە لە سکی دایکیدا ببێتە هۆکارێک کە سەلامەتی و باری تەندروستی و ژیانی خانمەکە بخاتە مەترسییەوە، بە بۆچوونی بیرمەندو کەسانی پسپۆڕو ژیر، ئارامگرتن لەسەر ئەو هەڕەشەیە سروشتی نەبێت، بە لەبەرچاوگرتن و لادانی ئەو زیانەو ڕەچاوکردن و پاراستنی خانمەکە کە بوونێکی حەتمی و زیندووە، دەکرێت مۆڵەتی لەباربردنی کۆرپەلەکەی وەر بگیرێت.

### سێیەم: لەباربردنی کۆرپەلە لەگەڵ ڕێگری لە سکپڕی

ڕێگرتن لە حاڵەتی سکپڕی بە هەر ئامرازێک ئەنجام بدرێت، بە واتای ڕێگرتن دێت لەوەی ئافرەت بکەوێتە قۆناغی دووگیانییەوە. ئیمامی غەزالی سەبارەت بەم حاڵەتەو جیاوازیکردنی لەگەڵ لەباربردنی کۆرپەلەدا دەڵێت: ڕێگری لە سکپڕی لەگەڵ لەباربردنی کۆرپەلەدا جیاواز دەبێت لەوەی لەباربردنی کۆرپەلە تاوانێکە بەرانبەر بە یەک بوونەوەر ئەنجام دەدرێت، لە کاتێکدا کە لە حاڵەتی ڕێگری لە سکپڕیدا بەم شێوەیە نییە، چونکە هێشتا بوونەوەرێک بوونی نییە. کۆرپەلە لە منداڵدانی دایکیدا بە چەند قۆناغێکی جیاوازدا گوزەر

دەكات، كە خۆی لە قۆناغە جیاوازەكانی: تنۆک (نُطْفَة)، خۆهەڵواس (عَلَقَة)، گۆشتپارە (مُضْغَة)، ئێسک (عَظْم) و گۆشت (لَحْم) دەبینێتەوە. ئەگەر تاوانێک بەرانبەر خانمێكی دووگیان ڕوو بدات كە كۆرپەلەكەی لە قۆناغی (گۆشت) دا بێت، واتە دوای ئەوەی كۆرپەلە گیانی بەبەردا دەكرێت، ئەوە سزای زیاترو فراوانترە لەوەی لە قۆناغەكانی پێشتردا بێت، چونكە نزیكە لە هاوشێوەی مرۆڤێكی تەواو (الغزالي، بێ ساڵی چاپ: ٢٥).

هەروەها بە سەرنجدان لە پێناسەی لەباربردنی كۆرپەلە لەگەڵ ڕێگری لە سكپڕی جیاوازیی ڕوون بەدی دەكرێت كە ئەم دوو كردارە جیاوازن. بەڵام ئەگەر هات و كرداری ڕێگریكردنەكە ببێتە هۆكاری زیانگەیاندن بە تاوانلێكراو، بۆ نموونە دروستبوونی حاڵەتی نەزۆكیی بەردەوامی ژن، لەو كاتەدا بە تاوان ئەژمار دەكرێت و ڕەزامەندیی تاوانلێكراو هیچ كاریگەریی نابێت. شایەنی وتنە كە ڕێگری لە سكپڕی لە یاسای زۆرێک لە وڵاتانداو لە شەریعەتی پیرۆزی ئیسلامیشدا ڕێگەپێدراوەو بە حاڵەتێكی ئاسایی دا دەنرێت، بە مەرجێک نەبێتە هۆی نەزۆكیی بەردەوام. بۆیە لەباربردنی كۆرپەلە كۆتایی پێهێنانی حاڵەتی دووگیانییە پێش كاتی سروشتیی خۆی و پێویستە لەم حاڵەتەدا كۆرپەلە بوونی هەبێت، و پاشان هەنگاو بۆ لەباربردنی كۆرپەلەكە پێش كاتی سروشتیی هاتنەدنیای بنرێت. بەڵام ئەگەر هیچ حاڵەتێكی دووگیانی بوونی نەبێت و كۆرپەلەیەک نەبێت لەبار ببرێت، ئەوا هیچ بوارێک بوونی نییە تێیدا باس لە لەباربردنی كۆرپەلە بكرێت.

## مێژووو بنەمای لەباربردنی کۆرپەلە

پێشتر لەباربردنی کۆرپەلەمان لە ڕوانگەی پێناسەی زمانەوانی و زاراوەییەوە خستە ڕوو، هەروەها جۆرەکانی لەباربردنی کۆرپەلەمان پیشان دا، دواتریش جیاوازییمان لەگەڵ ناونیشانە لەیەکچووەکانیدا ڕوون کردەوە. لەم بەشەدا گرنگە چاوێک بە مێژووو بنەمای لەباربردنی کۆرپەلە بخشێنین و تیشک بخەینە سەر گرنگترین ئەو قۆناغە مێژووییە جیاوازانەی لەباربردنی کۆرپەلە پێیدا گوزەری کردووە.

### مێژووی لەباربردنی کۆرپەلە

لەباربردنی کۆرپەلە لە کایە جیاوازەکانی مێژوودا

پێشینەی مێژوویی لەباربردنی کۆرپەلە بۆ زەمەنێکی زۆر دووری نێوان گەلە جیاوازەکان دەگەڕێتەوە، بە شێوەیەک دەتوانرێت ڕیشەی ئەم دیاردەیە لە شارستانێتییە جیاوازە کۆنەکان، بۆ وێنە وڵاتی چین لە سەردەمی شننونگ (٢٧٠٠ پێش میلاد)، میسری کۆن لە سەردەمی پاپیروس (١٥٥٠ پێش میلاد) و ئیمپراتۆرێتیی ڕۆم (٢٠٠ پێش میلاد) وەر بگرین. کتێبە مێژووییەکان دەری دەخەن لەباربردنی کۆرپەلە لە کۆندا بە ڕێکارو شێوازی جۆراوجۆر ئەنجام دراون، بۆ نموونە سوودوەرگرتن لە گژوگیای سروشتی، ئامێری تیژ، فشارهێنان بۆ ناوچەکانی کەمەری ئافرەتی دووگیان، یان دانانی شتی قورس لەسەر سکی خانمەکە یاخود بازدان و خۆ هەڵدانەخوارەوە لە شوێنی بەرزو، شێوازی تر. هەندێک جار ئەم کارە لەلایەن پزیشک یان مامانەکانەوە بە شێوازی نایاسایی و لە بارودۆخ و شوێنی پەنهاندا ئەنجام دەدران، هەر بۆیە لە یۆنانی

کۆندا قوتابیانی کۆلێژە پزیشکییەکان سوێند دەدران کە خۆیان لە لەباربردنی کۆرپەلە دوور بگرن. یاسا پزیشکییەکانی سۆکرات ڕەنگدانەوەی ئەو بارودۆخ و ڕێکارە جیاوازانەن کە لە ئەنجامی ڕەچاونەکردنی ڕێنماییە پزیشکییەکان لە کرداری لەباربردنی کۆرپەلەدا دروست دەبوون (لە سایتی www.fa.wikipedia.org وەرگیراوە).

لە شارستانێتیی ڕۆمدا ئەگەر ژنێک کۆرپەلەی لەبار ببردایە، سەرۆک خێزان مافی ئەوەی هەبوو ئەو خانمە ئاگادار بکاتەوە. دوای ئەو قۆناغە، فەیلەسووفە ڕۆمانییەکان بوونە هۆکاری ئەوەی لەباربردنی کۆرپەلە ڕێگەپێدراو بێت، بەڵام بە بوونی مەرجی تایبەت. دوای تێپەڕبوونی ماوەیەک دووبارە لە یۆنان و ڕۆم سزای سەخت بۆ ئەوانەی کۆرپەلەیان لەبار دەبرد دیار کرا، لەبەر ئەوەی بڕوایان وا بووە کە میراتگری خێزان لەناوبراوەو کۆڵەکەیەکی نەژادییان لەق کراوە (حکمت، ١٩٦٦: ٢٧).

لە شارستانێتیی بابیلدا، یاسای حامورابی یەکەمین یاسا بووە کە لەباربردنی ئەنقەست و نائەنقەست کۆرپەلەی لە ماددەکانی ٢٠٩ تا ٢١٢ ڕوون بکاتەوە (محمود الأمین، ١٩٦١: ٦٠). بۆ نموونە لە مادده ٢٠٩ی یاساکەدا هاتووە کە ئەگەر هات و کەسێک ژنێکی دووگیان ئازار بدات و ئەو ئازاردانە ببێتە هۆی لەبارچوونی کۆرپەلەکەی، پێویستە دە سکەی زیو بدات. بە هەمان شێوە لە مادده ٢١٠ی یاساکەدا هاتووە کە ئەگەر هات و لە ئەنجامی ئەو ئازاردانەدا خانمە دووگیانەکە بمرێت ئەوا پێویستە لە سەر بکەری تاوانی لەباربردنەکە کچێکی خۆی بکوژێت.

لە شارستانێتیی گریکدا بە هەمان شێوە لە باربردنی کۆرپەلە لە کتێبەکانی ئەفلاتووندا باسی لێوە کراوە. بۆ وێنە، ئەرستۆ بۆچوونی وابووە کە لەباربردنی کۆرپەلە ڕێگەپێدراو بێت بۆ خانمێک بە مەرجێک تەمەنی لە چل ساڵ تێپەڕی کردبێت، فەلسەفەی ئەم ڕێگەپێدانەیش کۆنترۆڵکردنی بەرزبوونەوەی ژمارەی دانیشتووان بووە (الوتري، ١٩٨٢: ١٠٣).

لە تەواوی قۆناغە جیاوازەکانی مێژووی مرۆڤایەتیدا، هەر لە کۆمەڵگە سەرەتاییەکانەوە بیگرە، کە حوکمڕانی تێیدا لە چوارچێوەی هۆزدا کۆ بووبووەوە، تا کۆمەڵگە پێشکەوتووەکانی ئێستا، لەباربردنی کۆرپەلە بە شێوازی جیاواز بوونی هەبووە. ئەم دیاردە مێژووییە زیاتر لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە لە مێژوویەکی زۆر دووری مرۆڤایەتیدا بە تاوان هەژمار کراوەو سزای جۆراوجۆری بۆ دەستنیشان کراوە. بەڵام لە هەر یەکێک لەو قۆناغ و مێژووە جیاوازانەدا، بە لەبەرچاوگرتنی هەلومەرجی کاتی و شوێنی و بیروبۆچوونی یاسادانەران و دادوەرانی ئەو کۆمەڵگانە، کاردانەوەی جیاوازیان لەو ڕووەوە لێ کەوتووەتەوە. لە قۆناغەکانی مێژوودا، هەندێک لە کۆمەڵگەکان لەباربردنی کۆرپەلەیان بە کردارێکی دروست و ڕێگەپێدراو لە قەڵەم دەدا، بە پێچەوانەشەوە کۆمەڵگەی تر بە تاوان دەیان ناساند. لێکۆڵینەوە مێژووییە نوێکان دەری دەخەن لەباربردنی کۆرپەلە لە هەزارەی سێیەمی پێش میلاد دا لە شاری سوختەی نزیک لە بابیل بوونی هەبووە. ئەفلاتوون لە ناسازیی لەباربردنی کۆرپەلەدا پێی وایە کە: مافی دووگیانی ئافرەت پێویستە تەنیا لە ژێر فەرمان و چاودێریی دەستەیەکی بچووکی ناو کۆمەڵگادا بێت، کە دەسەڵاتی ئابووری و کۆمەڵایەتیی پەروەردەی منداڵیان

هەبێت. خەڵکانی تری ناو کۆمەڵگە کاتێک بۆیان هەیە مۆڵەتی منداڵبوون وەر بگرن کە ئەو دەسەڵاتانەی سەرەوە بەدەست بهێنن (عباسي، ۱۳۸۲: ۱۷).

هەروەها سەبارەت بە وڵاتە جیاوازەکانی جیهان، بابەتی لەباربردنی کۆرپەلە بابەتێکی گرنگی نێو یاساکانیانەو هەر وڵاتەو بە جیاوازی و جۆری سیستمی یاسادانانەکەی هاتووە قسەی لەسەر ئەم دیاردەیە کردووەو ڕێکخستنی تایبەتی بۆ کردووە. لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە نیوەی دووەمی سەدەی ۱۹دا، قسە لەسەر لەباربردنی کۆرپەلە کراوە، بەڵام لە چوارچێوەی دەستووری وڵاتدا نەخراوەتە ڕوو، بەڵکو هەر ویلایەتەو بە وێنەیەکی جیاوازو تایبەت ڕێکخستنی بۆ ئەنجام داوە. یەکەمین ڕێگری و بەتاوانداناني لەباربردنی کۆرپەلە لە ساڵانی ۱۸۲۰ کاری لەسەر کراوەو، لەباربردنی کۆرپەلە لە دوای تێپەڕبوونی چوار مانگی دووگیانی بە یاسا ڕێگریی لێ کراوە. تا سەرەتاکانی ساڵی ۱۹۰۰ لە زۆرێک لە ویلایەتە جیاوازەکانی تر بە تاوان ناسێنرا.

سەبارەت بە وڵاتە ئەوروپییەکانیش، زۆرێک لەو وڵاتانە لەباربردنی کۆرپەلەیان (نەک بە شێوەیەکی گشتی، بەڵکو لە چەند بابەتێکی تایبەتدا) بە یاسایی کردوە، لەوانە بەریتانیا، فەرەنسا، ئەڵمانیا، ئیتاڵیا، ئیسپانیا، پورتوگال و پۆڵەندا. سەبارەت بە ڕووسیایش کە زۆرترین ئاماری لەباربردنی کۆرپەلەی لەسەر ئاستی جیهاندا تێدا تۆمار دەکرێت، لە ساڵی ۱۹۵۵ لە بارێکی یاساییدا ناساندی.

لە کیشوەری ئەفریقایش، ئەفریقای باشوور لەسەر بنەمای یاسایی ساڵی ۱۹۹٦ لەباربردنی کۆرپەلەی بە یاسایی ئەژمار کرد. بەڵام زۆربەی وڵاتەکانی تری ئەم

کیشوەرە لەباربردنی کۆرپەلەیان قەدەغە کردوە، مەگەر تەنیا لە بارێکدا کە مەترسی بۆ سەر گیانی خانمەکە دروست بکات (راپۆرتی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی، ٢٠٠٤).

بە پشتبەستن بە لێکۆڵینەوەکانی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی لە ساڵی ١٩٩٩ دا، لە ئێستادا زۆرێک لە وڵاتە ئیسلامییەکان، لەوانە بەحرێن، عێراق، ئوردن، لوبنان، کوێت، عومان، قەتەر، سعودیە، تورکیا، ئیمارت، یەمەن، مالیزیاو پاکستان، بە وێنەی جیاوازو لە ژێر سێبەری ئەو ئەنجامانەی ڕێکخراوی ناوبراو پێی گەیشتووە، زەمینەی ڕێگەدان و بە یاسایی دانانی لەباربردنی کۆرپەلەیان تەنیا لە حاڵەتی پێویستدا، ڕێک خستووە. سەرەڕای ئەوەی ڕازیبوون بە لەباربردنی کۆرپەلە لە بارودۆخی پاراستنی ژیانی دایک، لە لایەن تەواوی وڵاتانی ناوهێنراو، بەشێک لەو وڵاتانە (لەوانە ئوردن، سعودیەو پاکستان) لە چوارچێوەیەکی فراوانتری بنەماکانی لەباربردنی یاساییدا هەنگاویان هەڵگرتووەو سەرەڕای ڕزگارکردنی ژیانی دایک، سەلامەتی ڕۆحی و دەروونیان لەبەر چاو گرتووە. وڵاتانی تری وەک قەتەرو کوێت، سەرەڕای حاڵەتەکانی سەرەوە، حاڵەتی بوونی کۆرپەلەیەک کە کەموکوڕیی جەستەیی هەبێت دەکرێت فراوانترو لە چوارچێوەی لەباربردنی یاساییدا جێگەی بکرێتەوە. لە یاسای وڵاتانی بەحرەین و تورکیایش بە هەمان شێوە بەڵام بە شێوازی جیا لەوەی لە ڕاپۆرتی ڕێکخراوەکەدا هاتووە لە وێستگەیەکی فرانتردا هاتوون لەباربردنی کۆرپەلەیان ڕێک خستووە، ئەوەیش لە پێناو پاراستنی سەلامەتیی دایک و کۆمەڵگەیش، بۆ کەمکردنەوەی ئەو ئەنجامە خراپانەی لە لەباربردنێکی

ناتەندروست و مردنی دایکانی دووگیاندا دەکەونەوە (راپۆرتی ڕێکخراوی تەندروستیی جیهانی، ١٩٩٩).

## مێژووی لەباربردنی کۆرپەلە لە ئاینەکاندا

### ١. لەباربردنی کۆرپەلە لە ئاینی زەردەشتیدا

لە سوننەتی کۆنی ئاینی زەردەشتیدا، کە خاوەنی هزری کۆنی ئەفسانەیین، لەباربردنی کۆرپەلە بە تەواوی بە ناڕەواو نارێک دانراوە. بۆیە ئەنجامدانی ئەم کردارەیان هاوسەنگ کردووە بە تاوانی کوشتنی بە ئەنقەست کە بەرانبەر بە کەسێکی باڵغ ئەنجام دەدرێت (اقایی، ١٣٨٦: ٨٩).

لەم ئاینەدا لەباربردنی کۆرپەلە بە گوناهی گەورە ئەژمار کراوە. لە ئاڤێستای کۆندا، کۆرپەلەیەک کە کەمتر لە چوار مانگ و دە ڕۆژ بێت زۆر گرنگیی پێ نەدراوە، بەڵکو ئەگەر لەو تەمەنە زیاتری هەبووبێت، واتە پاش ئەوەی کۆرپەلە ڕۆحی بەبەرا دەکرێت، سزای بۆ دەستنیشان کراوە. هەروەها لەم کتێبەدا ئاماژەکراوە بەوەی (من بە هیچ شێوەیەک مۆڵەت بە بەکارهێنانی ئامرازی لەباربردنی کۆرپەلە بە هیچ خانمێک نادەم) (اخوندی، ١٣٨٠: ٦٣). چەندین جار لە چەندین برگەی ئاڤێستادا ئاماژە بەم بابەتە کراوە، بۆ وێنە لە ئاڤێستای یازدەدا هاتووە کە بە هیچ بیانوویەک ڕێگە بە لەباربردنی کۆرپەلە نادرێت، هەتا ئەگەر بێت و لە پێناو پاراستنی ئابڕووو شەرمکردن لە خەڵکیش بێت.

### ٢. لەباربردنی کۆرپەلە لە ئاینی جوولەکەدا

بە هەمان چەشن لە ئاینی جوولەکەدا لەباربردنی کۆرپەلە بە بابەتێکی ناڕەواو گوناه دادەنرێت، ئەگەرچی

له ڕووکاردا له کتێبی پیرۆزی تەوراتدا بەتایبەتی قسە لەسەر ئەم بابەتە نەکراوەو لەباربەری کۆرپەلە بە سزای تۆڵەکردنەوە (قصاص) سزا نەدراوەو بەرانبەر بە سزای کوشتن ئەژمار نەکراوە، بەڵام بە پشتبەستن بە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز، بۆ نموونە ئەگەر هات و خەڵکی بکەونە جەنگەوەو لەو کاتەدا لە ژنێکی دووگیان بدرێت و کۆرپەلەکەی لەبار بچێت، و زیانی دیکەی لێ نەکەوێتەوە، ئەوا بکەری تاوانەکە بە سزای پێبژاردن سزا دەدرێت (لە سایتی www.mehrkhane.com وەرگیراوە).

٣. لەباربردنی کۆرپەلە لە ئاینی مەسیحیدا

له ئینجیلی پیرۆزدا هیچ جۆرە ئاماژەیەکی ڕوون لەبارەی لەباربردنی کۆرپەلەوە نەهاتووە، زیاترو بە شێوەیەکی گشتی لەم کتێبەدا بابەتانی ئەخلاقی هاتووە نەک یاسایی. لەبەر ئەوە سەرچاوەو پاشکۆی ئەوانەی بە لەباربردنی کۆرپەلە دژ بوون، جۆرە تەفسیرێک بوو لە نێوان زانایانی ئاینی مەسیحیدا لەبارەی دەقەکانی ئینجیلەوە خراوەتە ڕوو. بەپێی بۆچوونی ئەم دەستەیە، ئەگەرچی کتێبی پیرۆز دەقێکی ڕاستەوخۆو ڕوون و ئاشکرای سەبارەت بە حەرامبوونی لەباربردنی کۆرپەلە تێدا نییە، بەڵام بە تەماشاکردنی دەقە جیاوازەکانی ئەم کتێبە ئاماژەی ئاشکراو ڕوون هەن لەبارەی شکۆو گەورەیی پێگەی مرۆڤەوە، جا چ پێش لەدایکبوونی بێت یان دوای لەدایکبوونی، کە دەرخەری ئەوەن پێویستە خۆپارێزی بکرێت لە ئەنجامدانی لەباربردنی کۆرپەلە. لەم ئاینەدا، کە یەکێکە لە ئاینە ئیبراهیمییەکان، لە بارێکدا کە مانەوەی کۆرپەلە لە منداڵدانی دایکیدا ببێتە هۆکاری دروستکردنی مەترسی بۆ سەر ژیانی خانمەکە، لە

چوارچێوەیەکی فراوانتردا تەماشا کراوە (محقق داماد، ١٩٧٩: ١١١).

هەروەها لە ئاینی مەسیحێتیدا لە نێوان کاسۆلیک و پرۆتستانەکاندا ڕاجیایی سەبارەت بە لەباربردنی کۆرپەلە دەر دەکەوێت. ئەوانەی سەرسامن بە بۆچوونەکانی کڵێسای کاسۆلیکییەکان لە ڕۆمدا دژ بە لەباربردنی کۆرپەلەن، تەنانەت ئەگەر لەلایەن پزیشکی پسپۆڕپیشەوە ئەنجام بدرێت. بەڵام لە بەرانبەردا پرۆتستانەکان بە لەباربردنی پزیشکی ڕەزامەندن. کاسۆلیکەکان پێیان وایە ئەگەر هات و بە شێوەیەکی ئەنقەست منداڵێک بمرێت و نەشۆررێت ئەوا ناچێتە بەهەشتەوە (عباسی، بی سالی چاپ: ١٤-١٥).

لە ساڵی ٣١٤ میلادی ئەنجومەنی مەزهەبی ئینسبروک بکەرانی لەباربردنی کۆرپەلەیان بە ١٠ ساڵ زیندانی سزا داوە. بە هەمان چەشن لە سەدەکانی پێشوودا ئەنجومەنی ڤاتیکان لەباربردنی کۆرپەلەی وەک منداڵ کوشتن ئەژمار کردووە. لەسەر ئەم بنەمایە لە ساڵی ١٩٨٧ ئەنجومەنی ڤاتیکان بەیاننامەیەکی دەر کرد کە دەڵێت پێویستە گیانی مرۆڤ پاریزگاری لێ بکرێت. بۆچی؟ چونکە لە یەکەم قۆناغدا کە هێشتا کۆرپەلەیەو لە سکی دایکیدایە خودا ئەو ژیانەی پێ بەخشیوە، پێویستە لەو قۆناغەوە ڕەچاوی ئەوە بکرێت بپارێزرێت و چاودێریی بکرێت.

### مێژووی یاسایی لەباربردنی کۆرپەلە لە عێراقدا

بە شێوەیەکی گشتی یاسای تاوانی عێراقی و بە تایبەتی یاسای سزادان بە سێ قۆناغی سەرەکیدا گوزەری کردووە: قۆناغی یەکەمیان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئیمپراتۆرییەتیی عوسمانی لە ساڵی ١٥٣٤ ەوە

تا دەستپێکردنی جەنگی جیهانی یەکەم، ئەو کاتە عێراقیش بەشێک بووە لە قەڵەمڕەویی ئەو ئیمپراتۆرێتییەو لەژێر دەسەڵاتیدا بووە. سیستمی یاسایی و سیاسی دەسەڵاتداری عوسمانی کاریگەر بووە بە بنەما پیرۆزەکانی شەریعەتی ئیسلامی و لەو سۆنگەیەوە بە حوکمی ئەوەی لەباربردنی کۆرپەلە لە شەریعەتی ئیسلامیدا ڕێگەپێدراو نییە، بۆیە عوسمانییەکانیش لە ژێر کاریگەری ئەو بنەمایانە، لەباربردنی کۆرپەلەیان قەدەغە کردووەو لە یاسای سزادانەکانیاندا سزای تایبەتیان بۆ داناوە.

قۆناغی دووەمی یاسای سزادان لە عێراقدا لە پاش کۆتایی هاتنی دەسەڵات و حوکمڕانی ئیمپراتۆرێتیی عوسمانیدا دەست پێ دەکات. ساڵی ١٩١٨ لە سەروبەندی کۆتاهاتنی جەنگی جیهانی یەکەمدا عێراق دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیاوە، بۆ یەکەمین جاریش لە ساڵی ١٩٢١ دەوڵەتی پاشایەتی لە عێراقدا دروست دەبێت و ساڵی ١٩٥٨ سیستمی حوکمڕانییەکەی لە پاشایەتییەوە دەگۆڕرێت بۆ کۆماری. بە گەڕانەوە بۆ سەرەتاکانی حوکمڕانیی بەریتانییەکان لە عێراقدا، بۆ یەکەمین جار ساڵی ١٩١٨ یاسای سزادانی عێراقی لە ژێر ناوی (قانون العقوبات البغدادي) دەرچوێنرا. تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە لەم یاسایەدا لە چوارچێوەی سێ ماددەدا (کە بریتین لە ماددەکانی ٢٢٩، ٢٣٠ و٢٣١)[١] بە تاوان ناسێنراوەو ڕێگەی لێ گیراوە.

---

[١] **ماددەی ٢٢٩:** هەموو خانمێک کۆرپەلەکەی لەبار ببات بە بەکارهێنانی هەر ئامرازێکی تایبەت بەو بوارە، یان ڕێگەی دا کەسێکی دیکە بۆی ئەنجام بدات بە سوودوەرگرتن لەو ئامرازانە، بەند دەکرێت بۆ ماوەیەک لە سێ ساڵ زیاتر نەبێت.

قۆناغی سێیەمی یاسای سزادانی عێراقی دوابەدوای ئەو گۆڕانکارییانە دێت کە بە سەر ناوو ماددە جیاوازەکانی یاسای سزادانی بەغدادی هات و جێکردنەوەی ئەو یاسایە لە ژێر ناوی یاسای سزادانی عیراقی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩ کە تا ئێستاش بەرکارە. ئەم یاسایەش وەک ئەوەی پێش خۆی، لەباربردنی کۆرپەلەی بە کۆمەڵێک گۆڕانکارییەوە لە سێ ماددەی یاساییدا (٤١٧، ٤١٨ و٤١٩) دا ناساندووەو بە تاوانی داناوە.

بە شێوەیەکی گشتی بە چاوخشاندن بە ناوەڕۆکی ماددەکانی یاسای سزادانی بەغدادی وەک قۆناغی دووەمی یاسای سزادانی عێراقی تایبەت بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە، لەگەڵ ماددەکانی یاسای سزادانی عێراقی بەرکار، دەر دەکەوێت کە ڕێدۆزی یاسادانەر لەبارەی ئەم تاوانەوە، بەتاواندانانی ئەم دیاردەیە بووە.

---

**ماددەی ٢٣٠:** هەموو کەسێک بە ئەنقەست منداڵی خانمێک بە رەزامەندیی خۆی لەبار ببات، سزا دەدرێت بە بەندکردن بۆ ماوەی سێ ساڵ زیاتر نەبێت، و ئەگەر لەباربردنەکە یان ئەو ئامرازانەی بەکار هێنراون ببێتە هۆی مردنی تاوانلێکراو ئەوا تاوانکار بە سزای (أشغال شاقە) بۆ ماوەیەک کە زیاتر نەبێت لە حەوت ساڵ زیندانی دەکرێت.

**ماددەی ٢٣١:** هەموو کەسێک کە بەبێ ڕەزامەندیی خانمێک کۆرپەلەکەی لەبار ببات لەگەڵ ئەوەی کە زانستی بە دووگیانبوونی هەبووبێت، بە زیندانیکردن کە زیاتر نەبێت لە ١٠ ساڵ سزا دەدرێت. ئەگەر لەباربردنەکەیش یان ئەو ئامرازانەی بەکارهێنراون ببێتە هۆی مردنی تاوانلێکراو، تاوانکار بە سزای (اشغال شاقە)ی هەتاهەتایی، یان (أشغال شاقە) یان زیندانیکرن بۆ ماوەیەک کە زیاتر نەبێت لە ١٥ ساڵ سزا دەدرێت.

واتە یاسادانەری عێراقی لەو دوو قۆناغە سەرەکییەدا دنیابینیی بۆ لەباربردنی کۆرپەلە ئەوەبووە کە بە ڕەفتارێکی تاوانکاری بیناسێنێت، سەرباری چەند گۆڕانکارییەکی گرنگ کە سەبارەت بەم تاوانە لە یاسا بەرکارەکەی ئێستایدا ئەنجامی داوە، لەوانە:

لە ماددەی ٢٢٩ی یاسای سزادانی بەغدادی سزای بکەری تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە تەنیا سێ ساڵ بەندکردنی بۆ دانرابوو، لە بەرانبەردا لە ماددە ٤١٧ی یاسای سزادانی عێراقی ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩، سزای بکەری تاوانەکە بووە بە کەمتر لە یەک ساڵ بەندکردن لەگەڵ سزای پێبژاردن.

هەروەها ئەگەر هات و خانمە دووگیانەکە بە هۆکاری لەباربردنەکە، گیان لەدەست بدات، ئەوا لە هەر دوو یاساکەدا سزای ٧ ساڵ زیندانی دیار کراوە بۆ تاوانباری تاوانەکە، بەڵام لە ماددە ٤١٧ی یاسا بەرکارەکەی ئێستادا، یاسادانەر دوو بڕگەی گرنگی بۆ ئەم حاڵەتە زیاد کردوە: لە بڕگەی سێیەمی ماددەی ئاماژەپێدراوی سەرەوە یاسادانەر باسی لە حاڵەتی قورسکردن (مشددة)ی تاوانەکە کردووە لە حاڵەتێکدا ئەگەر هات و بکەری تاوانەکە پزیشک یان دەرمانساز یان کیمیاگەر یان مامان بێت. هەروەها لە بڕگەی چوارەمی هەمان ماددەدا یاسادانەر باس لە حاڵەتی سووککردنی سزای تاوانەکەی کردووە، کە ئەگەر بێت و خانمەکە بە هۆکاری زینا یان هەر حاڵەتێکی تری دوور لە ئابڕوو دووگیان بووبێت و، بکەری تاوانەکەش یەکێک بێت لە نزیکانی خانمە دووگیانەکە تا پلەی دووەم.

هەروەها سەبارەت بە ماددەی ٢٣١ی یاسای سزادانی بەغدادی، لە بارێکدا ئەگەر لەباربردنەکە بەبێ ڕەزامەندیی خانمە دووگیانەکە ئەنجام بدرێت، ئەوا

سزای بکەری تاوانەکە بریتییە لە ١٠ ساڵ زیندانیکردن. ئەم ئاستی سزایە لە یاسا نوێکەدا گۆرانکاریی بەسەردا نەهاتووە، بەڵام لە هەمان ماددەدا دەڵێت ئەگەر خانمە دووگیانەکە بە هۆکاری لەباربردنەکە گیان بسپێرێت ئەوا لە ماددە ٢٣١ی یاسای کۆن، بکەری تاوانەکە بە کارکردنی قورسی هەتا هەتایی، یاخود تەنیا کارکردنی قورس (الأشغال الشاقة)، یاخود زیندانیکردن تا ١٥ ساڵ سزا دەدرێت، بەڵام لە یاسا نوێکەدا تەنیا سزای ١٥ ساڵ زیندانیکردنی دیار کردووە.

هەروەها سەبارەت بە ماددە ٤١٩ی یاسای سزادانی عێراقی، یاسادانەر ئاماژەی بە حاڵەتێک کردووە کە ئەگەر هات و بکەری تاوانەکە بە ئاگاداربوون لەوەی خانمەکە دووگیانەو بەبێ ئەوەی مەبەستی لەباربردنی کۆرپەلەکەی هەبووبێت، خانمەکە بە لێدان یان بریندارکردن یان کاری توندوتیژی یان پێدانی دەرمانی زیانبەخش یان هەر کردارێک کە پێچەوانەی یاسا بێت، دەستدرێژیی بکاتە سەر، بەبێ ئەوەی ویستی لەباربردنی کۆرپەلەکەی هەبێت، بەڵام کردارەکەی ببێتە هۆی لەبارچوونی کۆرپەلەکەی ئەوا بە سزای بەندکردن سزا دەدریت. بەڵام لە یاسا کۆنەکەدا هیچ ئاماژەیەک بەم حاڵەتە نەکراوە.

## بنەمای بەتاواندانانی لەباربردنی کۆرپەلە

بەتاواندانان، پرۆسەیەکە بە هۆیەوە یاسادانەری هەر وڵاتێک بە لەبەرچاوگرتنی نەریت و بەهاو باوە گرنگ و بنەرِتییەکانی جڤاک و بە پشتبەستن بە بنەما هزرییەکان دەگات بەو باوەڕەی بوار بە ئەنجامدان یان ئەنجامنەدانی کردارێک بگرێت، بۆ ئەو ئامانجەش گرەنتی جێبەجێکردنی سزایەکی گونجاو دا دەڕێژێت. لەسەر ئەم

بنەمایە بەتاواندانان بابەتێکی فرە ڕەهەندەو پاڵپشت و کاریگەرە بە زانستەکانی تری وەک زانستی فەلسفەی یاساو زانستی سیاسی و ئاینی و کۆمەڵناسی... هتد (اقابابای، ١٣٨٤: ١١).

لەباربردنی کۆرپەلە، تاوانێکی سروشتی بووەو بە درێژای مێژوو بەتاوان ناسێنراوە. بەڵام بەیاساییکردنی لە ئێستادا کە لە یاسای هەندێک لە وڵاتانی دنیادا دەیبینین، بە هۆکاری کاریگەربوونی کۆمەڵگاکانە بە دنیای مۆدێرنەوە. بە درێژای مێژوو مرۆڤەکان هاوڕابووە لەسەر ناشیرینی و ناڕێکی ئەم دیاردەیەو، ئەوەی بەئەنجامدانی ئەم جۆرە دیاردە نابەجێیە تێوەگلابایە ئەوا لە کۆمەڵگەدا نەفرینی لێ دەکراو، بەدەر لە جۆری کۆمەڵگەکە کە کۆمەڵگەیەکی ئاینی یاخود پابەند بوو بێت بە کۆمەڵێک بنەماو ئاکاری گشتیی تایبەت بە خۆیەوە یان نا. لەسەر ئەم بنەمایانە لە کۆمەڵگاکاندا جۆرێک لە هاوهەڵوێستی و کۆدەنگی دروست بووبوو کە نابێت کۆرپەلە لە مافی ژیان بێبەش بکرێت. ئەم جۆرە لە هاوهەڵوێستی، بناغەیەکی لۆژیکی لەم بابەتە نیشان دەدات. بۆیە لەم سۆنگەیەوە ناتوانرێت پاڵپشت بە بەڵگە مێژووییەکان، ئەم بابەتە بێبەها تەماشا بکرێت و نادیدە بگیرێت.

بە سەرنجدان و وردبوونەوە لە یاسا جیاوازەکانی عێراق، لە نێوانیاندا سیاسەتی تاوانی عێراقی، لە بەرانبەر جۆرو تایبەتمەندیی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ زۆرێک لە تاوانەکاندا، لە نێوانیشیاندا تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە، دەر دەکەوێت کە یاسادانەری عێراقی زۆر کاریگەر بووە بە بنەما پیرۆزەکانی شەریعەتی ئیسلامی، لەبەر ئەوە جۆری هەڵسەنگاندن و بڕیاردان بۆ هەر کردارێک، زۆربەی کات پشت قایم بووە بە بنەماکانی شەریعەتی

ئیسلامی، یا بە جۆرێک لە جۆرەکان کاریگەریی لەسەر دروست کردووەو سەرچاوەیەکی سەرەکی یاسادانانی بووە، تا لەو سۆنگەیەوە بڕیاری دروست و گونجاو دەر بکرێت.

خودای گەورە بە درێژایی مێژوو یاساو ڕێنمایی جیاوازی بۆ بوونەوەران لە نێوانیشیاندا ئادەمیزاد ناردووە، تا لە ڕێگەیانەوە بتوانن ژیانی ئاسایی خۆیان لە ژێر سێبەری ئەو ڕێنماییانە ڕێک بخەن، کە گشتگیرترین و تەواوترینیان ئەوانەن کە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا جێی کردوونەتەوە.

خودا لە قورئانی پیرۆزدا لە سوورەتی (الأنعام) ئایەتی ١٥١ دا ئاماژە بە حەرامبوونی لەباربردنی کۆرپەلە دەکات، کە دەفەرموێت ﴿وَلَا تَقْتُلُواْ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ﴾ "واتە: هیچ کەسێک مەکوژن کە خودا حەرامی کردبێت لەسەرتان، مەگەر بە حەق نەبێت". هەروەها لە کتێبە فیقهییەکانیشدا بە شێوەیەکی بەرفراوان و دیار لەسەر لەباربردنی کۆرپەلە بۆچوونیان داوە، جگە لەوەی بە تاوانیان داناوە، سزای جۆراوجۆری وەک سزای کەفارەیشیان بۆ بڕیار داوە.

لە شەریعەتی ئیسلامیدا کۆرپەلە مافی ژیانی هەیەو هیچ کەسێک مافی ئەوەی نییە ئەو مافە لە هیچ کۆرپەلەیەک بسەنێتەوەو پایەماڵی بکات. لەناوبردن و لەباربردنی کۆرپەلە لە ئیسلامدا حەرامکراوو قەدەغەکراوەو سزای قورس بۆ تاوانباری ئەو تاوانە لە بڕیار دراوە، تەنانەت باوک و دایکیش مافی ئەوەیان نییە بڕیار لەسەر لەباربردنی کۆرپەلەکانیان بدەن. گرنگترین و یەکەمین مافی کۆرپەلە بریتییە لە مافی ژیان و بەردەوامیدان بە ژیانی داهاتووی، و بە دەمودەست

قەرارگرتنی تۆوی پیاو لە لەشی ئافرەت و دووگیانبوونی، مافی ژیان بۆ کۆرپەلە دەسەلمێنرێت، دایک و تەواوی خزم و کەسوکاری کۆرپەلەکەو کۆمەڵگەش مافی دەستدرێژیکردنیان بۆ سەر ژیانی ئەو کۆرپەلەیە نییە. یەکەمین فەرمانی شەریعەت تایبەت بە پاراستنی مافی ژینی کۆرپەلە قەدەغەکردنی لەباربردنیەتی. لە یاسای ئیسلامدا لەو شوێنەی کە کۆرپەلە خاوەنی مافی ژیانە، تەواوی مرۆڤەکان بە بێ جیاوازی پابەندن پاراستنی ئەو مافە لەبەرچاو بگرن و، دایک و باوک بە پلەی یەکەم بەرپرسیارێتیی چاودێریکردن و پاراستنی ئەو کۆرپەلەیەیان لەسەر شان دەبێت، لەبەر ئەوە لەباربردن و زیانگەیاندن بە کۆرپەلە قەدەغەو تاوانەو سزای قورسی بۆ قەرار دراوە. بۆیە ڕوون دەبێتەوە پاراستنی کۆرپەلە لە یاسای ئیسلامدا بابەتێکی تەواو گرنگ و پارێزراوەو، بووەتە جێگەی گرنگیپێدانی یاسادانەران و، سزای کەفارەو دیەو سزای ماددی.. هتدی بۆ دەستنیشان کراوە (شومان، ١٣٩٤: ١٤-١٥).

لە فەلسەفەی سزاداو بە بەراوردکردنی بە زانستی ئەخلاق کاتێک قسە لەسەر گوناه و جۆری پەیوەندیی لۆژیکی لەگەڵ تاواندا دەکرێت، ڕووبەڕووی بۆچوون و ڕاجیایی بەرفراوان لە قۆناغە جیاوازەکاندا دەبینەوە، ئەمەش وای کردووە دەسەڵاتداران و بەڕێوەبەرانی وڵات لە دارشتنی یاساکانیانیاندا پێی کاریگەر بن. لە فیقهی ئیسلامیدا ڕەنگدانەوەی یاسای سزادانەکەی لەسەر بنەمای ئەخلاقیاتی کۆمەڵگەو ئەوەی لە چوار مەزهەبە گرنگەکەیدا هاتووە، دارێژراوە، بۆیە لەباربردنی کۆرپەلە بە ناونیشانی تاوان ناسێنراوە.

یاسادانەرانی ئیسلام، لەباربردنی کۆرپەلەیان بە ڕەفتارێکی نائەخلاقی بینیوە کە هەڕەشە لە بەهێزی و پتەوبوونی کۆمەڵگە دەکات. بە مانایەکی دیکە لەبەر ئەوەی بە بۆچوونی یاسادانەر لەباربردنی کۆرپەلە لەگەل ئەخلاقی هاوبەشی کۆمەڵگە دژەو، لەلایەکی دیکەوە پابەندنەبوون بەم بنەما ئەخلاقییەی کۆمەڵگە بە ڕێژەیەکە کە کاریگەریی نەرێنی پابەندنەبوون پێیەوە زۆر زەق و بەرفراوانە کە لە کۆمەڵگەدا مایەی قەرەبووکردنەوە نییە. لەم سۆنگەیەوە ڕازیبوون بەوەی لە ژێر ناونیشانی یەک ڕەفتاری تاوانکاری ئەم کردارە ڕاڤە بکرێت دەتوانرێت لەو لێکەوتە خراپ و مەترسییانەی لێیەوە دەکەونەوە ڕووبەڕوو ببینەوە. بە واتایەکی تر، پاڵپشت بەو جیاوازییانەی لە نێوان یاسای سزادان و زانستی ئەخلاق هەن، لەم خاڵەدا لەگەڵ یەکتریدا تێکەڵ بوون و لەوانەیە بتوانرێت بوترێت کە یاسا دانەر سزایی بە ناونیشانی مەدەدکارێک بۆ جێبەجێکردن و فراوانکردنی بنەماکانی ئەخلاق و پاراستنی بەها باڵاکانی کۆمەڵگە، سوودی وەرگرتووە. هەروەها بۆ ئاراستەکردنی بنەما ئەخلاقییەکانی لەباربردنی کۆرپەلە دەتوانین بڵێین کە هێشتا بۆ ئادەمیزاد تا ئەو ڕادەیە بوار نەڕەخساوە نە تەنیا بۆ جەستەی خۆی دەستوەردان بکات، بەڵکو ڕێگەدان بە دەستتێوەردان لە دروستبوونی ئادەمیزاد دا هەنگاو بە هەنگاوی لێ سەنراوەتەوە. بۆچی؟ چونکە مافی ژیان بە ناونیشانی یەکەمین بەخشش بە گەورەترین پاداشت دا دەنرێت کە خوداوەند بە دروستکراوانی عەتا کردووەو، هیچ بوونێکی دیکە مافی ئەوەی نییە دەستتێوەردانی تێدا بکات و ئەم مافە لە ئادەمیزاد زەوت بکات (مهاجرین، ١٣٧٨: ١٤٦).

لە ڕوانگەی ژیرییشەوە بە هەمان شێوە فەرمان بە حەرامبوون و قەدەغەبوونی ستەم دەکرێت و گەورە زانایان فەرمان بە حەرامبوونی ستەم دەکەن، بۆیە لە ڕوانگەی ژیرییەوە کۆرپەلە بوونێکە کە لە هەر قۆناغێکیدا بێت، لەباربردنی حەرام و نادروستە، لەبەر ئەوە عەقڵی دروست لەباربردنی کۆرپەلە بە دەستدرێژیکردن دەزانێت بەرانبەر بە کەسێک کە توانای نییە بەرگری لە خۆی بکات.

لەو هۆکارو بنەمایانەی تر کە وایا کردووە یاسادانەر فەرمان بە قەدەغەکردنی لەباربردنی کۆرپەلە بکات بریتییە لە پاراستنی مانەوەی کیان یان پەیکەری خێزان. هەروەها بنەمای (لاَ ضَرَر) کە یەکێکە لە بنەما ناسراوەکانی فیقە، لە حاڵێکدا کە کۆرپەلە نەبێتە هۆی دروستکردنی مەترسی بۆ سەر ژیان و تەندروستیی خانمەکە، ئەوا ڕێنوێنی بە قەدەغەبوونی لەباربردنی کۆرپەلە دەکات.

**تیۆرییەکانی تایبەت بە لەباربردنی کۆرپەلە**

لە بەرجەستەبوونی هەر جۆرە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگەدا فەیلەسوف و شارەزایانی بواری کۆمەڵناسی و کۆمەڵایەتی هاتوون بەپێی ئەو پاڵنەرو فاکتەرە گرنگانەی بوونەتە هۆکار بۆ دروست بوونی ئەو دیاردانە، تیۆریگەلی جیاوازو گرنگیان لەو بارەوە خستوەتە ڕوو. بۆ لەباربردنی کۆرپەلەیش وەک یەکێک لە دیاردە دیارەکانی ناو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی زانایان و شارەزایانی بواری کۆمەڵایەتی، هەر یەکەو بەپێی دیدگای تایبەتی خۆی، قسەو باسی گرنگ و کاریگەریان لە چوارچێوەی چەند تیۆرییێکدا خستووەتە ڕوو. هەندێک لەو تیۆرییانە پاڵپشتی لەباربردنی

کۆرپەلەن و بە دەرخستنی چەند فاکتەرو بیانوویەک ڕێگەیان بەلەباربردنی کۆرپەلە داوە. لە بەرانبەردا، تیۆریی دیکە خراوەتە ڕوو کە بە تەواوی لەباربردنی کۆرپەلەی قەدەغە کردووەو بە بوونی چەند هۆکارێک ڕێگەی بە لەباربردنی کۆرپەلە گرتووە. تیۆریی دیکەش هەن کە بە شێوەیەکی ڕێژەیی بواری بۆ لەباربردنی کۆرپەلە کردووەتەوە. لەبەر ئەوە لەم بەشەدا سێ تیۆریی گرنگ دەخەینە ڕووو شرۆڤەیان دەکەین:

### ١- تیۆریی قەدەغەکردنی ڕەهای لەباربردنی کۆرپەلە

ئەم تیۆرییە بە کۆنترین تیۆریی بواری لەباربردنی کۆرپەلە ئەژمار دەکرێت، کە لەژێر کاریگەریی پاڵنەرە ئاینییەکاندا دامەزراوە (غانم، ٢٠٠١: ١١٨). لە هەموو بارودۆخێکدا لایەنگرانی ئەم تیۆرییە، بە شێوەیەکی ڕەها ڕێگر بوون لە لەباربردنی کۆرپەلەو لەژێر هیچ مەرجێکدا ڕێگەیان پێ نەداوە. ئەم ڕێگریکردنە ڕەهایە لە لەباربردنی کۆرپەلە وای لە لایەنگرانی ئەم تیۆرییە کردووە کە چەند بەڵگەو هۆکار بۆ پاڵپشتیکردنی ڕاو بۆچوونەکانیان بخەنە ڕوو کە لە خوارەوە ئاماژە بە گرنگترینیان دەدەین:

**یەکەم: پاراستن و چاودێریکردنی وەچەی ئادەمیزاد**

یەکێک لە پاڵنەرکانی تیۆریی قەدەغەکردنی ڕەهای لەباربردنی کۆرپەلە، پاراستنی وەچەی ئادەمیزاد دەکەنە فاکتەرو ئامانج، لەوەش پاراستنی وەچەی مرۆڤ بە بەشێک لە ئاسانکاریی بەرکەماڵ بوونی مرۆڤ و نزیکبوونەوەی لە خودا دەزانن. لەم ئەندێشەیەدا، مرۆڤ مافی دەستدرێژیکردنی بۆ سەر گیانی خۆی و ئەوانی

تری نییە، بەڵکو پابەندە بە پاراستن و چاودێریکردنی ئەم ئەمانەتە خوداییە (عباسی، ١٣٨٢: ٢٢).

**دووەم: پاراستنی بەرژەوەندییە کۆمەڵایەتییەکان**

لایەنگرانی ئەم تیۆرییە بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی کۆمەڵایەتی حوکم بە قەدەغەکردنی لەباربردنی کۆرپەلە دەدەن. ئەمانە کەسانێکن پێیان وایە پێویستە کۆمەڵگە بگاتە ئەوپەڕی پێشکەوتن و پارێزگاریی لێ بکرێت و، ڕایان وایە نرخی تاک تەنیا لە چوارچێوەی کۆمەڵگەدا بەبەهایەو کۆمەڵگەش بەبێ بوونی تاک کامڵ نابێت. بۆیە پێویستە بە هەر شێوەیەک بێت ڕێگری لە بەهەدەرچوونی مافی کۆمەڵگە بکرێت. لە دیدگای ئەم دەستەیەوە، دایک بوونێکە کە بە لەدایکبوونی کۆرپەلە ڕۆڵێکی بنەڕەتی لە بەرەو پێشەوەچوون و هەراشبوونی کۆمەڵگە دەگێڕێت. بۆیە لەباربردنی کۆرپەلە لەو جۆرە تاوانانە ئەژمار دەکەن کە لە بازنەیەکی بەرفران و گشتگیردا زیان بە پەیکەری کۆمەڵگە دەگەیەنێت (عباسی، هەمان سەرچاوە: ٢٣).

**سێیەم: مافی هەڵبژاردنی کۆرپەلە**

بە گوێرەی ئەم تیۆرییە ئەگەر کۆرپەلەیەک لە سکی دایکیدا وەک مرۆڤێک قەبوڵ بکەین و ڕازی بین بە بوونی ئەو وەک هەر کەسێکی ئاسایی، ئەوا پێویستە لە بەرانبەردا ڕازی بین بە مافی هەڵبژاردنی ئەو کۆرپەلەیە لە زیندوومانەوەی و ژیانکردنی بە شێوەیەکی تەندروست. هەنگاونان بۆ کۆتاهێنانی حاڵەتی دووگیانی

بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەم مافە لە واقیعدا دانەنانی هیچ بەهایەکە بۆ کەسایەتیی مرۆیی ئەو.

بە بۆچوونی لایەنگرانی ئەم تیۆرییە، سەرەتای کۆرپەلەدانان، کە لە قۆناغی پیتاندنی هێلکە بە تۆوی پیاو لە هێلکەدانی ئافرەتدا دەست پێ دەکات و، بەشێک لە ئەندامەکانی کۆرپەلە لە ناو سکی دایکی دروست دەبێت و بەشێکی دیکەی لە دەرەوەی تەواو دەکات. ئەگەرچی بەشی سەرەکیی ئەندامەکانی کۆرپەلە لە چوارچێوەری منداڵدانی دایکیدا پێ دەگات، بەڵام بوونێکی تایبەت و سەربەخۆی خۆی هەیەو، دایک ناتوانێت بە فاکتەری بوونی بەرژەوەندیی نابەجێ و نەگونجاو بڕیار لەسەر لەباربردن یان لەناوبردنی ئەو بوونە بدات (کمپیل استیرو، ١٣٧٢: ١٨٩).

وابەستەبوونی کۆرپەلە بە دایکەوە لە قۆناغەکانی سکپڕیدا، بە مانای نکووڵیکردن لە بوونی ئەو کۆرپەلەیە نایەت، هەر وەک چۆن لە پاش لەدایکبوونی بە هەمان شێوە وەک کەسایەتییەکی سەربەخۆ، بە وابەستەبوونی بە دایک و باوک و دەوروبەرەکەی دەمێنێتەوە. بەڵام چۆن دەکرێت کەسێک بە ویستی خۆی بوونێک کە وابەستەیە بە خۆیەوە، بە هەر بیانوویەکی ناڕەوا هەستێت بە لەناوبردنی؟ (نوێنەرایەتیی کاروباری رۆشنبیریی وەزارەتی تەندروستیی ئێران، ١٣٧٠: ٢٤٧).

ئەوەی شایەنی ئاماژەپێدانە لایەنگرانی ئەم تیۆرییە پێیان وایە ئەو هۆکارو فاکتەرانەی تر کە دایک بە هۆیانەوە هەنگاو بۆ لەباربردنی کۆرپەلەکەی دەنێت، وەک مەترسی دروستبوون بۆ سەر ژیانی یان نەخۆشکەوتنی، جا بە نەخۆشیی جەستەیی بێت یان دەروونی، نابێتە پاڵنەرێکی گونجاو بۆ لەباربردنی کۆرپەلەو بە ڕەوایان دا نەناوە.

تیۆریی ئازادیی ڕەهای لەباربردنی کۆرپەلە سەرچڵییەکی بەرچاوی تێدا کراوەو، بە بۆچوونی زۆرێک لە بیرۆکەوانی ئەخلاقی بە ئامانجی بەرگریکردن لە ژیانی کۆرپەلە، ئەنجامدانی ئەم کردارەیان بە کردارێکی سەرزەنشتکراو ناساندووە. لە نێوان وڵاتانی دنیادا بە تایبەتی وڵاتانی ڕۆژئاوا، خواست لەسەر تێپەڕکردنی ئەو کۆت و بەندانە هەیە کە لە سەر ڕێگەی ئازادیی لەباربردنی کۆرپەلە دانراوان.

لایەنگرانی ئەم تیۆرییە بە خستنەڕووی بابەتی لەباربردنی کۆرپەلە لە ڕووپەڕی جیهاندا، ئازادیی لەباربردنی کۆرپەلەیان پەسەند کردووەو لە هەوڵ دان لە چوارچێوەیەکی یاساییدا جێگەی بکەنەوە. بە بۆچوونی لایەنگرانی ئەم دیدگایە لە ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤدا وەها بارودۆخێک پێش دێن کە جگە لە ئەنجامدانی لەباربردنی کۆرپەلە هیچ جۆرە ڕێگەیەکی تر نەبێت بۆ دەرچوون لێی و زۆربەی کات ئەو بنەماو ڕێکارانەی بڕیار دراون بۆ ئەم کردارانە ژێرپێ دەخرێن (محقق داماد، ١٣٧٣: ١٥٢).

لایەنگرانی ئەم تیۆرییە، کە بڕوایان بە پووچەڵکردنەوەو لابردنی تەواوی ئەو سنوورانە هەیە کە لەبەردەم لەباربردنی کۆرپەلەدا دانراون و ئازادیی بێ کۆت و مەرجی ئەو کردارە بە ڕەوا دەزانن، بە مەبەستی سەلماندنی بۆچوونەکانی خۆیان پشتیان بە کۆمەڵێک فاکتەر بەستووە کە بریتین لە:

**١- پاراستنی ژیان و تەندروستیی دایک**

کۆرپەلەیەک کە مەترسی بۆ سەر ژیان و تەندروستیی جەستەیی یان دەروونیی دایکەکەی دروست بکات، ئەمە فاکتەرو بەڵگەیەکە لە بەرانبەر

پاراستنی ژیانی خانمه دووگیانەکەدا، کە لە هەموو ڕوویەکەوە مرۆڤێکی تەواوەو بوونێکی واقیعیی هەیە، لەگەڵ کۆرپەلەیەک کە تا ئەو کاتەی دێتە ژیانەوەو کەسایەتیی مرۆیی پەیدا دەکات لە پێشترە.

**٢- کۆنترۆڵکردنی دانیشتووان و دەستەبەریی کۆمەڵایەتی**

لە ڕوانگەی مافی گشتییەوە، پێویستە لەسەر دەوڵەت، وەک ناوەندو یەکەم بەرپرس لە ڕێکخستنی کۆمەڵگە، لە پلان و بەرنامە ئابوورییە درێژخایەنەکانیدا کە بۆ سیاسەتی وڵات دای دەڕێژێت، لەپاڵ گرەنتیکردنی کاری شایستە بۆ هاونیشتمانییەکانی و شوێنی نیشتەجێبوون بۆیان، ڕێکارو ڕێنمایی تایبەت سەبارەت بە کۆنترۆڵکردنی ژمارەی دانیشتووان دا بڕێژێت، کە خۆی لە بەیاساییکردنی لەباربردنی کۆرپەلەدا دەبینێتەوە. بە کەمبوونەوەو دیارکردنی بەرژەوەندییە نشتیمانییەکان و داهاتی گشتی وڵاتان لە جێبەجێکردنی خزمەتگوزاریی دەستەبەریی کۆمەڵایەتی بە هاونیشتمانیانی خۆیان سەرکەوتوو بوون کە خاوەنی سیاسەتی کۆنترۆڵکردنی ژمارەی دانیشتووانی خۆیان بوون. لە فەرهەنگی هەندێک لە وڵاتانی جیهان دەربارەی ڕێژەی دانیشتووان کاردانەوەو ئەنجامی نەرێنیی خستووەتەوە، بەتایبەتی بۆ پڕکردنەوەی کەمیی ڕێژەی دەستی کار. ئەم وڵاتانە بۆ ئەوەی کەلێنەکە کەم بکەنەوە پەنایان بۆ وەرگرتنی پەنابەرانی وڵاتانی دیکە، بەتایبەتی لە وڵاتانی جیهانی سێیەمەوە، بردووەو بەو هۆیەوە ئەو کەلێنەیان پڕ کردووتەوە. لەم وڵاتانەدا حکومەت زانیاریی تەواوی دانیشتووان و خێزانەکانی بە وردی لەبەر دەستدایەو ئەگەر ئەو پەنابەرانەش کە ڕوویان تێ دەکەن پێویستیان بە بچووکترین خزمەتگوزاریی دەوڵەت بێت، بە

ئاسانترین ڕێگە دەتوانن بەدەستی بهێنن. لەو وڵاتانە، بۆ نموونە بەریتانیا، کەنەدا، ئەمریکا، ئوستralیاو، بەتایبەتییش وڵاتانی سویدو نەرویج، حکومەت ئامارێکی وردی هاوڵاتیانی بەتەمەن، بێکار، پەککەوتە، دایکانی خاوەن منداڵی هەتیو... هتدی لایەو، بەبێ هیچ کێشەیەک و بە بەردەوامی تەواوی خزمەتگوزارییە پێویستییەکانیان بۆ دابین دەکات، بەبێ ئەوەی ئەم توێژانە کە ئاماژەیان پێ درا ڕووبەڕووی مەترسی و کاردانەوەی کۆمەڵایەتی و نادادی ببنەوە، یان ئەوەی پێشکەشکردنی ئەم خزمەتگوزارییانە پێویستیی بە تێپەڕاندن و ڕێکاری زۆرو دوورو درێژ ببێت. لەم وڵاتانەدا دەستنیشانکردن و ڕێکخستنی ئەم جۆرە کەسانە بە مەرج و تایبەتمەندیی تایبەتەوە یەکێکە لە ئەرکە گرنگەکانی حوکمڕانیکردن (حسینی، ١٣٨٤: ٩٧).

زیادبوونی ژمارەی دانیشتووان، کە ئەمڕۆ بە تەقینەوەی دانیشتووان ناوزەند دەکرێت، فاکتەرو هۆکارێکە کە لایەنگران و پشتیوانانی ئەم دیدگایە پشتی پێ دەبەستن و، بە بڕوای ئەوان، کێشەو گیروگرفتی فراوانی کۆمەڵایەتی و ئابووری کە لە ئەنجامی زیادبوونی ژمارەی دانیشتووانەوە کەوتوونەتەوە. ڕێگەچارەی ئەو کێشانە بۆ ئەو دەوڵەتانە بریتییە لە کۆنترۆڵکردنی ڕێژەی زیادبوونی دانیشتووان، لەباربردنی کۆرپەلەیش بۆ ئەم ئامانجە بە سەرەکیترین ڕێگە دەزانن (محقق داماد، سەرچاوەی پێشوو: ١٥٢).

### ٣- بەرگریکردن لە ئازادییەکانی تاک

بەشێکی تر لەو فاکتەر پاڵنەرانەی پەیڕەوانی ئەم دیدگایە بۆ بەهێزکردن و پاڵپشتیکردنی بۆچوونەکانیان دەیخەنە ڕوو بریتییە لە بەرگریکردن لە ئازادییەکانی

تاک. هەروەها یەکێک لە ئامانجە گەورەو بەهێزەکانی یاسا، جا ئەو یاسایە یاسایەکی ئاسمانی بێت یان یاسایەک بێت بەپێی پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکان لەلایەن ئۆرگانە جیاوازەکانی دەوڵەتەوە دارێژرابێت، بریتییە لە پاراستنی ئازادییە ڕەواو بنچینەییەکانی تاکەکانی کۆمەڵگە. سەرچاوە ئاسمانییەکان کە بە هۆی سرووشەوە هاتوون و لە ڕێگەی پێغەمبەران و کتێبە ئاسمانییەکانەوە بڵاو بوونەتەوە، بە هەمان ڕەنگ ئازادیی مرۆڤ و بە ئازادی دروستکردنی ڕوون و ئاشکرا لە پەیامەکانیاندا ڕەنگی داوەتەوە. بەرپرسیارێتیی قورس و بنچینەیی کۆمەڵایەتیی دایکان و باوکان بۆ پەروەردەکردنی نەوەکانیان و گرەنتیکردنی باری داراییان پێویست بەوە دەکات بتوانن ئازادانە ئەوەی پەیوەندیدارە بە کاتی لەدایکبوونی منداڵەکانیان، خۆیان بڕیاری لەسەر بدەن. ڕێگریکردن لە دایک و باوک بە شێوەیەکی گشتی و بەتایبەتی دایک، لەوەی پەیوەندیدارە بە لەباربردنی کۆرپەلەی نەخوازراوەوە، ئەرک و بەرپرسیارێتییەکی زۆر قورس و فراوان بەسەریدا دەسەپێنێت، ئەم ئەرکە قورسە لە ئایندەداو بۆ چارەنووسی منداڵەکەش زۆر کاریگەر دەبێت. ئەم جۆرە سەپاندنە لەگەڵ بنەما گشتییەکانی یاسادا لە هاودژییەکی تەواودایە. حکومەت و کۆمەڵگە نابێت بێئاگاو دەستەوەستان بن بەرانبەر بە پێشبینیکردنی ئایندەی منداڵان لە دوای لێکجیابوونەوەی دایک و باوکانیان، هەروەها بەرانبەر بە چارەنووسی ئەو منداڵانە بێگوناهانەی بێسەرپەرشتن و ڕووبەڕووی نەبوونی و برسێتی دەبنەوە. سوودمەندبوون و گەیشتنی ئاسانی خەڵک بە ڕاوێژکاران بەبێ بەرانبەر لەوەی پەیوەندیدارە بە تەندروستی و بابەتە خێزانییەکان، هەروەها بە

ئاسانی گەیشتنی ژنان بە پزیشکانی پسپۆڕو خزمەتگوزاریی ئامادەکراو لە ناوەندە تەندروستییەکان، لە لەباربردنی کۆرپەلە نەخوازراوەکان، بە مافی بنچینەیی خەڵک دا دەنرێت. ئەنجامی ئەم پێداویستی و ئازادییە لە بەیاساییکردنی لەباربردنی کۆرپەلە لە دووگیانییە نەخوازراوەکاندا، نەک تەنیا بە ئازادیی دایک و باوک، بەڵکو بونیادی خێزان بەهێزو پتەوتر دەکات، هەروەها لەو ئازارو ناڕەحەتییانەی لە ئەنجامی حاڵەتی دووگیانییەوە دروست دەبێت، لە ئەنجامدا مردنی دایکان و نەخۆشکەوتنیان بە هۆکاری سوودوەرگرتن لەو لەباربردنانەی لەلایەن کەسانی ناتایبەتمەندو ڕەچاونەکردنی حاڵەتەکانی تەندروستی، بە سوودوەرگرتن لە ئامێرە سەرەتاییەکان، ڕێگری دەکات (حسینی، سەرچاوەی پێشوو:٩٧-٩٨).

٣- تیۆریی ئازادیی ڕێژەیی (نسبی) لەباربردنی کۆرپەلە

لە بەرانبەر تیۆری و دیدگاکانی پێشوودا، دیدگای تر هەن کە بە بەراورد بە دوو دیدگاکانی پێشوو حاڵەتێکی هاوسەنگی هەڵبژاردووە لەبارەی ئازادی و ڕێگریکردن لە ئەنجامدانی لەباربردنی کۆرپەلەوە. تیۆریی ئازادیی ڕێژەیی زۆرترین لایەنگری لە جیهاندا لە دەوری خۆی کۆ کردووەتەوە. تیۆریی ئازادیی ڕەهای لەباربردنی کۆرپەلە بە تەنیا ویستی دایک، تەنانەت ئەگەر پشتی بە هیچ هۆکارو پاڵنەرێکی ڕەوایش نەبەستبێت، بە ڕەوا دەبینێت. ئەوەی پەیوەندیدارە بە تیۆریی ڕێگریی ڕەهای لەباربردنی کۆرپەلەوە ئەوەیە ئەم تیۆرییە دانی بە تەواوی ئەو پێویستی و بەهانە ڕەوایانەی دەکرا ببنە هۆکار بۆ ئەوەی فراوانتر بیر لە کرداری لەباربردنی کۆرپەلە بکرێتەوە نەناوە، بۆ نموونە حاڵەتی وەها دێتە

پێش کە مانەوەی کۆرپەلە لە منداڵدانی دایکیدا ببێتە مایەی مەترسی دروستکردن بۆ سەر تەندروستی و ژیانی خانمەکە، لەم حاڵەتەدا باشترو گونجاوترە لە ڕێگەی یاساو بەپێی ڕێنماییە پزیشکییەکان، بڕیار لەسەر لەباربردنی کۆرپەلە بدرێت، کە ئەم حاڵەتە لە فیقهی یاسای تاوانیدا بە لەباربردنی یاسایی ناوزەند کراوەو لە دووتوێی زۆرێک لە یاسای وڵاتانی دنیادا جێگەی کراوەتەوە.

دواجار سەبارەت بە تیۆریی ئازادیی ڕێژەیی لەباربردنی کۆرپەلە، پاش ئەوەی کۆمەڵێک حاڵەتی ناچاری دێنە پێش و بە شێوەیەکی فەرمی دەناسێنرێن، پسپۆڕان و شارەزایان لەسەر بنەما زانستی و پزیشکییەکان، ئەنجامدانی لەباربردنی کۆرپەلەیان بە بوونی مەرجی تایبەت پەسەند کردووە.

شایەنی ئاماژەپێدانە هەوادارانی ئەم تیۆرییە ڕاجیاییان سەبارەت بەم ڕێگەپێدانە هەیە، بەڵام تەواوی ئەم ڕاجیاییە خۆی لە هەڵسەنگاندن و جۆری ئەو ناچاری و مەرجانەدا دەبینێتەوە کە بۆ ئەوەی ڕێگە بە لەباربردنەکە بدرێت دانراون. شێواوی کراوەتە بیانوویەکی عەقڵی بۆ ئەوەی کۆرپەلەی پێ لەبار ببرێت، هەرچەندە ئەم دەستەیەش ڕاجیاییان سەبارەت بە جۆری شێواوییەکان هەیە. دەستەیەکی تر لە هەوادارانی ئەم تیۆرییە ئەو نەخۆشی و بارە تەندروستییە سەختانەی دووچاری خانمەکە دەبنەوە کردوویانە بە فاکتەری دەستکراوەیی لە لەباربردنی کۆرپەلە. بە هەمان شێوە جۆری ئەو نەخۆشییانەی خانمەکە دووچاری دەبێت بووەتە خاڵی ڕاجیایی نێوان لایەنگرانی ئەم تیۆرییە. هەروەها هەندێک لە زانستمەندانی تر پێیان وایە کۆمەڵێک پێویستیی کۆمەلایەتی و ئەخلاقی وا دەکەن

هەر یەکەو بەپێی ئەو بنەماو حاڵەتە جیاوازانە لەباربردنی کۆرپەلە بە ڕەوا ببینن (وەزارەتی تەندروستیی ئێران، لە ڕێگەی طاهرە فرخی - یەوە، سەرچاوەی پێشوو: ٣٤).

## لەباربردنی کۆرپەلە لە ئیسلامدا

لە بەشەکانی پێشوودا لەباربردنی کۆرپەلەمان لە چەند وێستگەیەکدا ناساند، لە ڕوانگەی پێناسەو جۆرو مەبناو پێشینەی ئەم کردارە، پاشان جیاوازیمان کرد لەگەڵ کردارە هاوشێوەکانیدا، دواتریش باسمان لە سێ تیۆریی بنەڕەتیی تایبەت بەم کردارە کرد. لەم بەشەدا گرنگە لەباربردنی کۆرپەلە لە چوارچێوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا شرۆڤە بکەین.

ئەگەر تەماشای دەقەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بکەین دەبینین سەبارەت بە زۆرێک لەو کردار یان تاوانانەی لە کۆمەڵگەدا ڕوو دەدەن چوارچێوەیەکی زۆر فراوانی هەیە، بۆچوون و قسەو باس و ڕاجیاییەکی زۆر پان و بەرین لە نێوان زانایانی ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا بەدی دەکرێت. لەباربردنی کۆرپەلەیش وەک یەکێک لەو کردارانەی لە ناو کۆمەڵگەی ئیسلامی بوونی هەبووەو تا ئێستاش بەردەوامە، زانایان و پێشەوایانی ئیسلامی بۆچوون و بنەمای جیاوازیان خستووەتە ڕووو، هەر یەکەو بەپێی تێگەیشتنی تایبەتی خۆی لە دەقەکانی ئاینی ئیسلام قسەی لەسەر ئەم بابەتە کردووە.

لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین لە چوارچێوەیەکی سنووورداردا، لەباربردنی کۆرپەلە لە قورئانی پیرۆز، پاشان لە سوننەتدا بخەینە ڕوو، چونکە ئەوەندەی هەوڵمان داوە لەم کتێبەدا لە ڕووە یاساییەکەوە ئەم کردارە تاوانکارییە بە شێوەیەکی فراوان شرۆڤە بکەین،

کەمتر لە ڕووە ئاینیەکەیەوە گەنگەشەی دەکەین و، ئەو ئەرکە بۆ کەسانی پسپۆڕو شارەزا لە شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام بەجێ دەهێڵین، کە دەتوانن زۆر فراوانتر باسی لێوە بکەن.

وەک پێشتر خرایە ڕوو، لەباربردن چەند جۆرو شێوەیەکی هەیەو، بریتین لە لەباربردنی ئاسایی یان سروشتی، بە دەرمان، بە زەبرو، تاوانی. لە لەبارچوونی سروشتی یان ئاساییدا، لەبەر ئەوەی کە لە دەرەوەی خواستی ژن و مێرد یان هەر کەسێکی دیکەدا ڕوو دەدات و، هیچ کردارێکی تاوانکاری نابێتە هۆی ڕوودانی، بەڵکو بە هۆکاری نەخۆشی یان حاڵەتی تەندروستیی نەخوازراوەوە ڕوو دەدات کە خانمی دووگیان یان کۆرپەلەکەی دووچاری دەبنەوەو هیچ کەسێک دەستتێوەردانی تێدا ناکات، ئەم جۆرە لە لەباربردن هەم لە ڕوانگەی یاساییەوەو هەم لە ڕوانگەی ئاینیشەوە هیچ جۆرە بەرپرسیارێتییەک دروست ناکات.

ئەوەی دەمێنێتەوە سێ جۆرەکەی تریانە کە هەر یەکەیان بەپێی جۆری یاساو ئەو مەرجانەی بۆی دانراوە ڕێکاری یاسایی تایبەت دەیگرێتەوەو دەکرێت لە ڕوانگەی یاسایی و شەرعییشەوە بکەرو کەمتەرخەمی ئەنجامدەری ئەم کردارە بە شێوەی جیاواز تووشی بەرپرسیارێتی ببێتەوە.

پێش ئەوەی لەباربردنی کۆرپەلە لە ڕوانگەی فیقهییەوە بخەینە ڕوو، سەرەتا لە قورئانی پیرۆزدا ئەم کردارە ڕوون دەکەینەوە:

یەکەم: لەباربردنی کۆرپەلە لە قورئانی پیرۆزدا

بەسەرنجدان لە ئایەتە جیاوازەکانی قورئانی پیرۆز دەبینین ئاماژەیەکی ڕاستەوخۆ بە لەباربردنی کۆرپەلە

نییەو ئایەتێکی تایبەت نەکردووە کە ئاماژە بێت بە قەدەغەکردنی ئەنجامدانی ئەم کردارە، بەڵکو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز زیاتر ئاماژەی ئەوە دەدەن کە پێویستە لەسەر خانەوادەو دایکان و باوکان خۆیان لە کوشتنی نەوەکانیان دوور بگرن. ئەمەش وایکردووە کە لە نێوان تەفسیرکەرانی قورئان و زانایانی ئاینیی ئیسلامییەوە لە تێگەیشتن و مانا ناڕاستەوخۆکانی ئەم ئایەتە پیرۆزانە تایبەت بە ئەنجامدانی لەباربردنی کۆرپەلە بۆچوونی جیاوازو یەک جۆریان نەبێت. بێگومان پێش ئەوەی خودای گەورە موحەممەد (دروودی خوای لێ بێت) وەک نێرراوی خۆی ڕەوانە بکات بۆ ڕێنوێنیکردنی تەواوی ئادەمیزاد، دانیشتووانی دوورگەی عەرەبی لە نەزانی و دواکەوتوییەکی بێسنووردا بوون، لە زۆرێک لە وێستگە مرۆڤایەتییە باڵاکاندا لە دواوەی کاروانی پێشکەوتنی جیهاندا بوون، لە کاتی لەدایکبوونی منداڵەکانیاندا تێیاندا بوو ئەگەر منداڵەکەی لە ڕەگەزی مێ بوایە نەی دەهێشت بەردەوامی بە ژیان بدات و لەناوی دەبرد، ئەمە سەرەڕای ئەوەی بە هۆکاری جیاوازی ئاینی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، یان بۆ قوتاربوون لە شەرمەزاری و ئابڕووچوون بە تێگەیشتنی خۆیان، هەر لە سەروبەندی دووگیانبوونی خانمەکەدا بڕیاری لەناوبردنی ئەو کۆرپەلەیان دەدا. یان کاتی وا هەبووە بە ئامانجی نزیکبوونەوە لە بت و خواوەندەکانیان لە نەریتە بتپەرستانەکانیاندا بڕیاری لەناوبردنی کۆرپەلەیان داوە. بەڵام لە دوای ئەوەی خودای گەورە بە ناردنی موحەممەد (دروودی خوای لێ بێت)ی نێردراوی خۆی و لە ڕێگەی دابەزاندنی قورئانی پیرۆزەوە مرۆڤایەتی و بەتایبەتی خەڵکانی دورگەی عەرەبی لە تەواوی دواکەوتوویی و ڕەچاونەکردنی بەها مرۆڤایەتییەکان

ڕزگار کرد، زۆرێک لەو دواکەتوویی و نەزانییەی ڕەواندەوەو ژیانێکی نوێی بەهار ئاسای بە تەواوی دانیشتووانی جیهان بەخشی و لە ڕێگەی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزەوە جەختی لەسەر پاراستنی وەچەی مرۆڤایەتی و دەستدرێژینەکردن بۆ سەر هەر نەفسێک بەناڕەوا حەرام کردووە، کۆرپەلەشی وەک یەکەم قۆناغی زیادبوون و مانەوەی وەچەی ئادەمیزاد بە گرنگ داناوە، بۆیە لەباربردن و دەستدرێژیکردن بۆ سەر ئەم بوونە، پاڵپشت بە تەفسیرو بۆچوونی زۆرێک لە زانایانی ئیسلام، حەرام کراوەو بە گوناه ئەژمار کراوەو بکەری ئەم تاوانەیش هەم لە دنیاو هەم لە دواڕۆژدا ڕووبەڕووی سزای خودایی کراوەتەوە. لە خوارەوە ئاماژە بە چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز لەو بارەوە دەکەین:

خودای گەورە لە سوورەتی (المائدة) لە ئایەتی ٣٢ دا دەفەرموێت: ﴿مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِى ٱلْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا﴾ "واتە: ئەوەی کەسێک بە ناحەق بکوژێت و لە جیاتی کوژراوێک نەبێت، یان گوناه و تاوانی گەورەی ئەنجام نەدابێت لە زەویدا (وەک جەردەیی و دەستدرێژی و... هتد) ئەوە وەک ئەوە وایە هەر هەموو خەڵکی کوشتبێت".

هەروەها لە سوورەتی (النساء) لە ئایەتی ٩٣ دا دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَـٰلِدًا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا﴾ "واتە: هەر کەسێک بە دەستی ئەنقەست ئیماندارێک بکوژێت (بە حەڵاڵی بزانێت) ئەوە تۆڵەی ئەو کەسە دۆزەخە، نەمرە تێیدا، هەروەها خودا لێی توڕەبوووەو نەفرینی لێ کردووەو سزای گەورەو بێسنووری بۆ ئامادە کردووە".

کوشتنی نەفسیشی حەرام کردووە هەر وەک ئەوەی، لە سوورەتی (الإسراء) لە ئایەتی ٣٣ دا دەفەرمویت ﴿وَلَا تَقْتُلُواْ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ﴾ "واتە: کەسێک نەکوژن کە خودا کوشتنەکەی حەرام کردبێت مەگەر بە هۆی تاوانێکەوە کە شایستە بێت و کوشتنی ڕەوا بێت".

بە وردبوونەوەو تێڕامان لەم ئایەتە پیرۆزانە بە ڕوونی بە دیار دەکەوێت کە کۆرپەلەیەک پێش ئەوەی گیانی بەبەردا بکرێت، بە ناونیشانی مرۆڤێک کە لە ڕێگەی کامڵبووندایە، و لە دوای ئەوەی گیانی بەبەردا دەکرێت وەک نەفسێک و مرۆڤێکی تەواو ئەژمار دەکرێت، خوداوەند لە ڕێگەی ئەو ئایەتە پیرۆزانەوە، پاڵپشت بە تەواوی ڕاوبۆچوونی زانایان و پێشەوایانی ئیسلام لە تەفسیرو دەلالەتی ئەم ئایەتانە دەر دەکەوێت کە هەر جۆرە دەستدرێژی و هەڕەشەیەک بۆ سەر گیانی کۆرپەلە بە حەرام و تاوان ئەژمار کراوەو ئەنجامدەری تاوانەکە ڕووبەڕووی بەرپرسیارێتیی دنیاو دواڕۆژیش دەبێتەوە.

دووەم: لەباربردنی کۆرپەلە لە سوننەتدا

ئاشکرایە لەدوای قورئانی پیرۆز، سوننەتی پەیامبەری ئیسلام موحەممەد (دروودی خوای لێ بێت) وەک دووەمین سەرچاوەی شەریعەتی ئیسلامی لە جیهانی ئیسلامیدا پشتی پێ دەبەسترێت و زۆرێک لە حوکم و بڕیارە جۆربەجۆرەکان، لە بابەتە جیاوازەکاندا لەم ڕێگەیەوە بەرچاوڕوونی و بڕیارو حوکمی شەرعییان لێوە دەر دەچێت. لە ڕێگەی ئەم سەرچاوەیەوە زانایان و پێشەوایانی ئیسلامی، هەر یەکەو بەپێی تێگەیشتنی لە دەقە شەرعییەکان و دنیابینیی بۆ واقیع، تەواوی بۆچوون و حوکمە شەرعییەکانیان بەرجەستە کردووە.

زانایانی ئیسلامی، به تایبەتی هەر چوار ئیمامەکە، سەبارەت به لەباربردنی کۆرپەله وەک یەکێک له دیاردە کۆمەڵایەتییەکان و تاوانه مێژووییەکان، ڕاجیان و قسەی جۆراوجۆریان لەسەری هەیە، بەتایبەتی پێش ئەوەی گیان به بەر کۆرپەلەدا بکرێت.

حوکمی شەرعی لەباربردن چییەو ئەگەر هات و پاش بەبەرداکردنی ڕۆح بێت ڕای زانایان لەو بارەوە چۆنە؟

پەیامبەری ئیسلام (دروودی خوای لێ بێت) له چەند فەرموودەیەکدا ئاماژە به گوناهبوونی کرداری لەباربردنی کۆرپەله دەدات، بۆ نموونه له فەرموودەیەکدا که ئەبوداوودو نەسائی گێڕاویانەتەوە دەفەرموێت: '**كُلُّ ذَنْبٍ عَسى اللهُ أَنْ يَغْفِرَهُ إِلاَّ مَنْ مَاتَ مُشْرِكاً أَوْ مُؤْمِنٌ قَتَلَ مُؤْمِناً مُتعمداً**' "واته: خوا له گوناهی تەواوی ئادەمیزادێک خۆش دەبێت، مەگەر ئەوەی هاوبەش بۆ خودا دابنێت، یان ئەوەی کەسێکی بڕوادار به ئەنقەست و ناحەق بکوژێت". له فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرموێت: '**لَزَوالُ الدُّنيا أَهْوَنُ على اللهِ مِنْ قَتْلِ رَجُلٍ مُسلمٍ**' "واته: لەناوچوونی تەواوی دنیاَ لەلای خوداَوەند ئاسانترو ئەهوەنترە له کوشتنی کەسێکی موسڵمان". هەروەها له فەرموودەیەکی دیکەدا ئاماژەیەکی تری به پیرۆزبوون و گەورەیی خوێنی کەسێکی موسڵمان دەکات، دەفەرموێت '**لَوْ أَنَّ أَهلَ السَّماءِ أَوْ أَهلَ الأَرضِ اشتركوا في دَمِ مُؤمِنٍ لأَكَبَّهُم اللهُ في النَّارِ**' "واته: ئەگەر تەواوی ئەوانەی لەسەر زەوی و له ئاسماندان له بەهەدەردانی بەناحەقی خوێنی بڕوادارێک بەشدار بن ئەوا خودا هەموویان له ئاگردا دەسوتێنێت" (ابن عابدین، بێ ساڵ: ٣٨٠).

وەک پێشتر ئاماژەمان پێدا، زانایان لەبارەی لەباربردنی کۆرپەلەو کۆرپەلەیەکەوە کە ڕۆحی بەبەردا کرابێت لەگەڵ ئەوەی ڕۆحی بەبەردا نەکرابێت بۆچوون و قسەی جیاوازیان هەیە، بۆیە لە خوارە ئاماژە بە چەند قۆناغ و دۆخێکی جیاواز دەکەین کە دەکرێت لە چوارچێوەیەکی سنووورداردا، کۆکەرەوەی بابەتی لەباربردنی کۆرپەلە بێت لە فیقهی شەریعەتی ئیسلامیدا:

**أ- لەباربردنی کۆرپەلە پێش بەبەرداکردن و پاش بەبەرداکرنی ڕۆح**

بۆچوونی زانایان لەبارەی لەباربردنی کۆرپەلەیەکەوە پێش ئەوەی گیانی بەبەردا بکرێت، واتە پێش ئەوەی تەمەنی بگاتە چوار مانگ، جیاوازە. بێگومان ئەم جۆرە لە ڕاجیایی، بە هۆکاری نەبوونی دەقێکی ئاشکرا لەم بابەتەداو پشتبەستن بە ئیجتیهادەوە لە ژێر ڕۆشنایی مەبنا تایبەتییەکانی هەر مەزهەبێک سەرچاوەی گرتووە (طلعتی، ١٣٨٣: ٧٨٢).

لە فیقهی ئیمام ئەبو حەنیفەدا بۆچوون و قسەو باسێکی زۆر لەم بارەوە هەیە. زۆرێک لە زانایانی گەورەی فیقهی حەنەفی لەباربردنی کۆرپەلەیان پێش بەبەرداکردنی ڕۆح، واتە پێش چوار مانگی (بەبوون یان نەبوونی هەر پاساوێک)، بە جایزو ڕێگەپێدراو زانیوە. بەشێکی دیکەی زانایانی ئەم مەزهەبە پێیان وایە لەباربردنی کۆرپەلە پێش بەبەرداکردنی ڕۆح جایز نییە، مەگەر ئەوەی پاساوێک هەبێت.

لە فیقهی ئیمامی شافعیدا بەشێکیان پێیان وایە کە لەباربردنی کۆرپەلەیک پێش بەبەرداکردنی ڕۆح حەرامە. تۆوی پیاو پاش ئەوەی لە منداڵدانی ئافرەتدا جێگیرو

جۆرێک لە چەسپاوی وەردەگرێت، دەست بە گیرسان و کارو ڕەوتی پێکهاتن دەکات و بۆ ژیان ئامادە دەبێت، کاتێکیش کارو ڕەوتی پێکهاتنی کۆرپەلە لە پاش چل و دوو ڕۆژەوە دەست پێ دەکات و، لە ماوەی ئەم چل و دوو ڕۆژەدا لەباربردن بە ڕەوا دەبینن.

هەروەها بەشێکی دیکە لە پەیڕەوانی فیقهی شافیعی لەباربردنی کۆرپەلە تا ٨٠ ڕۆژ بە جایز دەبینن، نەک بە شێوەیەکی ڕەها پێش بەبەرداکردنی ڕۆح. لەنێوان زانایانی پەیڕەوانی فیقهی شافعیدا بۆچوونێکی بنبڕ هەیە کە جایزبوونی لەباربردنی کۆرپەلەیە پێش ٤٠ ڕۆژی، واتە تا ئەو کاتەی لە قۆناغی (نطفة) دایە. جگە لە ئیمامی غەزالی کە بڕوای وایە تۆوێک کە لە ناو منداڵدانی ئافرەتدا لە قۆناغی پیتاندایەو بۆ دروستبوونی تەواوو بەرەو بەبەرداکردنی ڕۆح لە ئامادەیی تەواودایە، لەباربردنی دروست نییە.

تەواوی زانایانیش لە فیقهی مالیکی ڕێک کەوتوون و پێیان وایە لەباربردنی کۆرپەلە پێش بەبەرداکردنی ڕۆح بە شێوەیەکی ڕەها (جا بە ئەنقەست یان نائەنقەست بێت) نادروستە، تەنانەت ئەگەر پێش چل ڕۆژییش بێت و حاڵەتی بوونی پاساو یان فاکتەریان نەبواردووە.

کۆمەڵێک لە حەنبەلەییەکان خستن و لەباربردن پێش تەمەنی چل ڕۆژی بە دروست دەبینن، بەڵام دوای ئەو کاتە بە دروستی نابینن، تەنانەت ئەگەر هات و نەخۆشییەکیش لە ئارادا بێت. بەشێکی دیکەیان لەباربردنی کۆرپەلە بە ڕەوا دەزانن تا ئەو کاتەی ڕۆحی بەبەردا دەکرێت، لەدوای ئەو ماوەیە بە جایزیان دانەناوە.

مەزهەبە جیاوازەکانی ئەهلی سوننەت لە لەباربردنی کۆرپەلە پاش بەبەرداکردنی ڕۆح کۆدەنگن و بە

شێوەیەکی ڕەها بە حەرامی دەزانن و، لە حاڵەتێکدا کۆرپەلە بە ئەنقەست لەبار ببرێت ئەوا بکەری بە شایەنی سزادان دەزانن، چونکە وای دادەنێن کۆرپەلە پاش بەبەرداکردنی ڕۆح چووەتە قۆناغی ژیانی مرۆییەوەو، لەباربردنی وەک کوشتنی مرۆڤێکی زیندووەو بەڵگەی حەرامیی کوشتنی نەفسیان بەسەردا گشتاندووە (زیدان، ١٤١٥: ١٢٢ و١٢٣).

محەمەد تەیب نەجار لەم بارەوە دەنووسێت: لەپاش بەبەرداکردنی ڕۆح، بە کۆدەنگیی تەواوی زانایانی مەزهەبە جیاوازەکان، لەباربردنی ئەنقەستی کۆرپەلە حەرام کراوە، بەڵام پێش بەبەرداکردنی ڕۆح، بە پێچەوانەی کۆمەڵێک بۆچوونەوە، جایز نەبوونی لەباربردنی بەبێ بوونی پاساوێکی ڕەوا، لەپێشترە. لەو فاکتەرو پاساوانەی کە لەم قۆناغەدا قەبوڵ دەکرێن بوونی هەڕەشەیە بۆ سەر گیان و سەلامەتیی خانمەکە، بەدەر لەوە لەباربردنی کۆرپەلەیک بە هۆکارو پاڵنەرێک بە مەبەستی قوتاربوون لە زۆریی ژمارەی منداڵان، یان بە هۆکارو کێشەی ئابووری، بە پاساوو پاڵنەری ڕەوا ئەژمار ناکرێن.

**ب- لەباربردنی کۆرپەلە لە دۆخێکدا کە سەلامەتیی دایك بخاتە مەترسییەوە**

بە لەبەرچاوگرتنی مەبناو بۆچوونی زانایانی ئەهلی فیقە و سوننەت، لە بارێکدا ئەگەر بێت و کۆرپەلەیەک ببێتە هۆکاری دروستکردنی مەترسیی گیانی و تەندروستی بۆ دایکەکەی، ئەوا وەک چارەسەر لەباربردنی پێش ئەوەی ڕۆحی بەبەردا بکرێت، بە جایزو دروست ئەژمار کراوە. ئەگەرچی ژمارەیەک لە زانایانی ئەهلی سوننەت بە شێوەیەکی ڕەها لەباربردنی

کۆرپەلەیان پێش تەمەنی چوار مانگی بە ڕەوا بینیوە (غانم، سەرچاوەی پێشوو: ٧٥١). بەڵام پاش ئەوەی گیانی بەبەردا دەکرێت، هەندێک لە زانایان بۆچوونیان وایە کە لەباربردنی دروست نییە هەرچەندە گیان یان تەندروستیی خانمەکەش لە مەترسیدا بێت، بە بەڵگەی ئەوەی کۆرپەلە پاش بەبەرداکردنی ڕۆح نەفسێکی ڕێزلێگیراوەو پاراستنی واجبە. بەڵگەیەکی دیکەشیان ئەوەیە کە ئەو مەترسییەی پزیشک ڕەچاوی دەکات مەترسییەکی پێشبینیکراوەو مەرج نییە بێتە دی، واتە مەرج نییە مەترسییەکی واقیعی بێت و حەتمەن هەر ڕوو بدات. هەروەها پێیان وایە ئەگەر ئەو مەترسییەی پێشبینی دەکرێت بگاتە قۆناغێک کە زیاتر پێشبینیی ڕوودانی ڕۆشن بێتەوەو ببێتە واقیع، ئەوا لەم کاتەدا دەکەوینە نێوان دوو بابەتی قەدەغەکراو، کە ئەوانیش پاراستنی ژیانی خانمەکەو لەباربردنی کۆرپەلەکەیە، کە هەردووکیان پێویستیان بە پاراستن و چاودێریکردن هەیە، لەم حاڵەتەیشدا هەندێک لە پسپۆڕو زانایان ڕزگارکردن و پاراستنی ژیانی خانمەکە بە لەپێشتر دەبینن و لەباربردنی کۆرپەلەکەیان بە جایز داناوە.

دەستەیەکی دیکە لە زانایان و پسپۆڕان لەباربردنی کۆرپەلەیان پاش بەبەرداکردنی ڕۆح بە دروست زانیوە ئەگەر ببێتە هۆکاری دروستکردنی مەترسی بۆ سەر گیانی دایکەکەی، بە مەرجێک دوو پزیشکی پسپۆڕو شارەزاو دادگەر دووپاتی بکەنەوە کە مانەوەی کۆرپەلەکە لە منداڵدانی دایکیدا هۆکاری دروستکردنی مەترسییە بۆ سەر تەندروستی و ژیانی و تەنیا ڕێگەی چارەسەرو نەهێشتنی ئەو مەترسییە بریتی بێت لە لەباربردنی کۆرپەلەکە. ئەمەش لەژێر ڕۆشنایی بنەما گشتییەکانی شەریعەتی ئیسلامی کە ئەنجامدانی کەمترین

و بچووکترین زیانە لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندییەکی گەورەتردا.

لەباربردنی کۆرپەلە لەم حاڵەتانەدا بابەتێکی بە بڕشت و دڵنیاکەرەوەیە:

**یەکەم:** دایک بنچینەیەو ژیانێکی سەربەخۆی هەیە.

**دووەم:** لە زۆرێک لە ماف و ئەرکە یاساییەکان بەهرەمەندە.

**سێیەم:** دایک کۆڵەکەی خێزانە.

لەبەر ئەمانە گونجاو نییە بۆ پاراستن و چاودێریکردنی ژیانی کۆرپەلە، کە ژیانێکی سەربەخۆو ماف و ئەرکێکی زۆری وەک خانمەکەی نەبێت، قوربانی بە ژیانی خانمەکە بکرێت (شلتوت، ١٣٩٥: ٩٢، طلعتی، سەرچاوەی پێشوو: ٩٩٢).

ج- لەباربردنی کۆرپەلە لە دۆخی شێواوییدا

سەبارەت بەو نەخۆشی و شێواوییانەی کۆرپەلە تووشی دەبێت دیدگاو بۆچوونی پسپۆڕان و زانایانی شەریعەتی ئیسلامی جیاوازە. بەشێکیان پێیان وایە لەباربردنی کۆرپەلە پێش تەمەنی چوار مانگی بە شێوەیەکی ڕەها جایزو دروستە. ئەوانەی پێش ئەو ماوەیە لەباربردنیان بە بوونی هۆکار یان فاکتەر بە جایز بینیوە، دەڵێن لەباربردنی کۆرپەلە پێش تەمەنی چوار مانگی دروستە لە حاڵەتێکدا کە دوو پزیشکی پسۆڕو تایبەتمەند پاڵپشتی بکەن کە ئەو نەخۆشی یان شێواوییەی کۆرپەلەکە تووشی بووە لەو جۆرە نەخۆشییانەیە کە بۆ خەڵکی تر دەگوێزرێتەوە، کەموکوڕی و نەخۆشیی دیکەی وەک کوێری، کەڕی، لاڵی، یان ئەوانەی لەم بابەتەن، کە دەکرێت بە

بوونیشیان کۆرپەلە بەردەوامی بە ژیانی خۆی بدات و نابنە هۆکارو فاکتەر بۆ ئەوەی بە هۆیانەوە لەبار ببرێت.

سەبارەت بە نەخۆشییەکی وەک ئایدز، بەپێی بۆچوونی ئەم دەستە لەزانایان، نابێتە هۆکاری لەباربردنی کۆرپەلەکە. لەبەر ئەوەی لە ئێستادا بەپێی ئەو پێشکەوتنانەی ئەمڕۆ زانستی پزیشکی پێی گەیشتووە، پێ دەچێت لە ڕوانگەی پزیشکییەوە چانسی چاکبوونەوەی هەبێت، پاشان گواستنەوەی ئەم نەخۆشییە بۆ خەڵکانی تر بێگومان نییە، بۆیە بە هۆی ئەو ئەگەرەوە کە مەرج نییە ڕوو بدات، ناکرێت بڕیاری لەباربردنی کۆرپەلە بدرێت.

سەبارەت بەو کۆرپەلەیەی تەمەنی زیاتر لە چوار مانگەو ڕۆحی بەبەردا کراوە، بەپێی بۆچوونی تەواوی زانایانی ئیسلام و ئەهلی سوننەت، بە هیچ شێوەیەک جایزو ڕێگەپێدراو نییە، هەتا ئەگەر هات و کۆرپەلەکە کەمئەندامی زگماکییش بێت یان نەخۆشی کوشندەشی هەبێت، مەگەر ئەوەی بەردەوامی و مانەوەی ئەم جۆرە کۆرپەلە نەخۆشە ببێتە هۆکاری دروستکردنی مەترسی بۆ سەر گیانی دایکەکەی، لەم بارەدا بە هۆکاری لادانی زیانێکی گەورەتر دەکرێت ڕێگە بە لەباربردنی بدرێت (غانم، سەرچاوەی پێشوو: ٣٨١- ٦٨١).

**د- لەباربردنی کۆرپەلە بە ئامانجی کۆنترۆڵکردنی ژمارەی دانیشتووان**

بەشێک لە پسپۆڕانی شەریعەتی ئیسلامی لەباربردنی کۆرپەلە بە ئامانجی کۆنترۆڵکردنی ژمارەی دانیشتووان بە دروست نابینن، بەتایبەتی ئەگەر بێت و پاش بەبەرداکردنی ڕۆح بێت. ئەمەیش پاڵپشت بە ئایەتی ٣١ی

سوورەتی (الإسراء) کە خودای گەورە تێیدا دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْۚ﴾ "واتە: نەکەن منداڵەکانتان لە ترسی گرانی و برسێتی بکوژن (چونکە پەروەردگارتان ڕۆزیبەخش و میهرەبانە) ئێمە رزق و ڕۆزی دەبەخشینە ئەوانیش و ئێوەش". بە بۆچوونی ئەم زانایانە ئەوانەی نایانەوێت منداڵیان ببێت و ڕێگر بن لە زۆربوونی نەوەکیانیان ئەوا دەتوانن سوود لە ڕێگەی ڕەواو دروست وەر بگرن.

بەشێکی دیکەی زانایان بە شێوەیەکی گشتی لەباربردنی کۆرپەلە پێش چوار مانگی بە جایز دەبینن و پێیان وایە چۆن دروستە ڕێگە لە دووگیانبوون بگیرێت (مەنعکردن لە پێناوی ڕێگری لە دووگیانی)، بە هەمان ڕەنگ دروستە کۆرپەلەیش پێش ئەوەی بگاتە تەمەنی چوار مانگی لەبار ببرێت، هەڵبەتە ڕەزامەندی و بۆچوونی دایک لەم بابەتەدا بە گرنگ دەبینن (شلتوت، سەرچاوەی پێشوو: ٤٩٢-٥٩٢).

# بەشی دووەم

# بنەماکانی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە

لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا خوێندنەوەیەکی گشتگیرمان سەبارەت بە زاراوەی لەباربردنی کۆرپەلە لە ڕوانگەی چەمک، جۆر، جیاوازیی لەباربردنی کۆرپەلە لەگەڵ ناونیشانە لەیەکچووەکانیدا، پێشینەو بنەمای لەباربردنی کۆرپەلە هەروەها ئەو تیۆرییانەی سەبارەت بەم بابەتە هەن خستە ڕوو، لە کۆتاییشدا لەباربردنی کۆرپەلە لە شەریعەتی ئیسلامیدا شرۆڤە کرد. لەم بەشی دووەمەشدا بنەما یاساییەکانی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە، کە خۆی لە چوار بنەمای بنەڕەتیدا دەبینێتەوە، دەخەینە ڕوو. بنەماکان بریتین لە ڕەگەزی تایبەتیی ڕوودانی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەو ڕەگەزی یاسایی و ماددی و مەعنەوی. هەروەها لە چوارچێوەی ئەم بەشەدا تیشک دەخەینە سەر دەستپێکردن (شروع) و بەشداریی تاوانکاری لە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەدا.

پێناسەی بنەما، لە ڕوانگەی زمانەوانییەوە، بەواتای بنچینە، ڕەگەزو جنس و ماددەی سەرەتایی هاتووە (جعفری لنگورودی، ١٣٨٧: ٤٦٧). لەپێناوی ئەوەی تاوانێک دابمەزرێت و بەتاوان دابنرێت و شایەنی ئەوە بێت کە سزای بۆ دابنرێت بوونی چەند بنەمایەک پێویستە، کە بە دوو دەستە دابەش دەکرێن: بنەما تایبەتییەکان و بنەما گشتییەکان.

لە ڕوانگەی یاساییەوە بۆ ئەوەی کردارێک بە تاوان ئەژمار بکرێت، سەرەتا پێویستە ئەم کردارە لەلایەن یاسادانەرەوە بە تاوان ناسێنرابێت و سزای گونجاوی بۆ دیار کرابێت. لە قۆناغی دووەمدا ئەنجامدانی ئەو کردارە یان ئەنجامنەدانی کردارێک کە یاسا پێویستی کردووە، بگاتە قۆناغی چالاکبوون. لە قۆناغی سێیەمیشدا پێویستە ئەو کردارە بە زانین و خواستی تەواوەوە ئەنجام بدرێت. ئەم ڕەگەزانە کە لە تەواوی تاوانەکاندا هاوبەشن و پێویستە بوونیان هەبێت بە ڕەگەزە گشتییەکان ناوزەند دەکرێن. بەڵام لە هەندێک حاڵەتدا بنەماو مەرجی تایبەت هەن کە لە ڕوودانی تاواندا کاریگەرن، ئەو جۆرانە لە مەرج یان بنەمای تایبەتدا جێیان دەبێتەوە. ئەم بنەمایانە لە تاوانە جیاوازەکاندا جیاوازن و دەبنە فاکتەری ناسینەوەی تاوانەکان و جیاکردنەوەیان لە هاوشێوەکانیان (گلدوزیان، ١٣٨٤: ٧٣).

سەرەڕای ئەو سێ بنەما سەرەکییەی سەرەوە، بەشێک لە بیرمەندانی بواری یاسا، لەوانە گاروی یاساناسی فەرەنسی، کامڵبوونی تاوانێک بوونی بنەمای چوارەم بە ناوی بنەمای ناحەق، بە مەرج دا دەنێن. ئەوان باوەڕیان وایە ئەنجامدانی تاوانێک لە چوارچێوەیەکدا کە یاسادانەر وەک سوودوەرگرتن لە ماف یان ئەنجامدانی ئەرکێک داینابێت نابێتە هۆی ئەوەی ڕێکاری یاسایی بەرانبەر بە بکەری کردارەکە بگیرێتە بەرو سزا بدرێت. بەڵام زۆربەی یاساناسان لەگەڵ ئەم بۆچوونە نین. ئەمان پێیان وایە ئەوەی پرۆفیسۆر گارۆو هاوڕاکانی بە بنەمای ناحەق ناوی دەبەن و بەمەرجیان داناوە، هەمان هۆیەکانی ڕێپێدان (أسباب الإباحة) یان لایەنێکن کە بنەمای یاسایی تاوانەکە ناهێڵین، بۆ نموونە مافی خودبەرگری (الدفاع الشرعي)

یان جێبەجێکردنی فەرمانی یاسایی. بۆیە باشترە بنەما یاساییەکانی تاوان هەمان ئەو سێ بنەمایانە بن کە لە سەرەتاوە ئاماژەیان پێ دراوە، بە نەهاتنەدیی هەر یەکێکیشیان، بۆ وێنە ڕەوابوونی کردارەکە واتە نەمانی بنەمای یاسایی، تاوانەکە نایەتە دی (أردبیلی، ١٣٨٩: ١٢٩).

لە خوارەوە باس لە هەر یەکە لەو سێ بنەما گرنگەی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە دەکەین و، بنەمای تایبەتی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەیش، کە بریتییە لە دووگیانبوونی خانمەکە، دەخەینە ڕوو.

## بنەمای یاسایی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە

ئەم بنەمایە پێویستە لە چوارچێوەی بنەمای یاساییبوونی تاوان و سزادا (قانونية الجرائم والعقوبات) بە دواداچوونی بۆ بکرێت (نوربها، ١٣٨٦: ١٣٩). بنەمای یاساییبوونی تاوان و سزا، بە ناونیشانی شاکلیلی یاسای سزادان ناسێنراوە. ئەسڵی یاساییبوونی سزاو تاوان، بەو واتایە دێت کە دەستنیشانکردن و دانانی یاسای سزادان تەنیا لە ئەستۆی یاسادایە. ئەم جۆرە بنەماو ڕێسایانە تەنیا دەتوانرێت لە وڵاتێکدا هەبن و بەرجەستە ببن کە یاسا تێیدا دەسەڵاتدارو سەروەر بێت و زیاتر لەم بنەمایەش، جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان قەبوڵکراو بێت و جێبەجێ بکرێت. هەروەها دەتوانرێت ڕیشەکانی ئەسڵی یاساییبوونی تاوان و سزا لە هزرو ئەندێشەکانی کۆتایی سەدەی هەژدەهەم وەر بگیرێت. جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ و هاوڵاتیبوونی فەرەنسا لەساڵی ١٧٨٩ یەکەمین بەڵگەنامەی فەرمییە کە بنەمای یاساییبوونی تاوان و سزای ناساندوە (لورانس لوترمی، ١٣٨٧: ٣٢).

بنەمای یاسایی کردارێک یان ئەنجەمنەدانی کردارێک بە هەر ئەندازەیەک کە ناشیرین و خراپ بێت و بۆ سیستمی کۆمەڵایەتی زیانبەخش بێت، تا ئەو کاتەی حوکم و بڕیارێکی لە بەرانبەردا دەر نەچوو‌بێت یان لە یاسادا هیچ پێشبینیەکی بۆ نەکرابێت، ئەوا شایەنی سزادان نییە. بە واتایەکی دیکە، مادام یاسادانەر کردارێک یان ئەنجامنەدانی کردارێکی بەتاوان دا نەنابێت و سزایەکی بۆ دیار نەکردبێت ئەوا ڕێگەپێدراوو موباحە. لەبەر ئەوە ڕوودانی تاوانێک و دەرچوونی سزایەک لە بەرانبەریدا بەستراوەتەوە بە زاراوەیەکی ڕوون و ئاشکراوە. لەبەر ئەوەی بەبێ بوونی یاسا تاوان ڕوو نادات، زیادەش نییە بڵێین کە یاسا ڕوکنی پێویستی تاوانە (پێویستی بنەمای یاسایی) (أردبیلی، سەرچاوەی پێشوو: ١٢٦).

بڕگەی دووی مادده ١٩ی دەستووری عێراقی لەسەر بنەمای یاساییبوونی تاوان و سزا دڵنیایی دەدات و دەڵێت: هیچ کەسێک تاوانبار ناکرێت و سزا نادرێت تەنیا بە دەق نەبێت، هیچ کەسێکیش سزا نادرێت تەنیا بەو کردەوانە نەبێت کە یاسا بە تاوانی دادەنێت و، لە کاتی ئەنجامدانی تاواندا نابێت سزایەک بسەپێنرێت کە توندتر بێت لەو سزایەی بۆ ئەو تاوانە دیار کراوە. بە هەمان شێوە لە هەمان ماددەدا لە بڕگەی پێنجەمدا هاتووە دەڵیت: تۆمەتبار بێتاوانە، تا ئەو کاتەی لە دادگایەکی یاسایی دادپەروەردا تاوانەکەی بەسەردا دەسەلمێت و، تاوانبار دوای ئازادبوونی بە هەمان تاوانی پێشوو دادگایی ناکرێت، مەگەر بەڵگەی نوێ سەر هەڵ بدات.

له یاسای سزادانی عێراقیدا ژماره ۱۱۱ی ساڵی ۱۹٦۹ سێ ماددەی تایبەت لەبارەی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەوە بە ژمارەکانی ٤۱۷، ٤۱۸ و٤۱۹[۱] هاتوون. کە

---

[۱] **مادده ٤۱۷:**

۱. سزا دەدرێت بۆ ماوەیەک کە نابێت لە ساڵێک زیاتر بێت و بە پێبژاردن کە نابێت لە سەد دینار زیاتر بێت، یان بە یەکێک لەم دوو سزایە، هەر ئافرەتێک بە هەر ئامرازێک کۆرپەلەکەی لەبار ببات یان بە ڕەزامەندیی خۆی کەسێکی دیکە ئەو کارەی بۆ بکات.
۲. سزا دەدرێت بە هەمان سزا هەر یەکێک بە ئەنقەست بە ڕەزامەندیی ئافرەتەکە کۆرپەلەکەی بۆ لەبار ببات و ئەگەر ئەو لەباربردنە، یان هەر ئامرازێکی تر کە لەو ڕووداوە بەکار هاتبێت هەر چەند نەبووبێتە هۆی مردنی تاوانلێکراو، ئەو کاتە سزاکەی زیندانیکردن دەبێت بۆ ماوەیەک نابێت لە حەوت ساڵ زیاتر بێت.
۳. بە بارودۆخی توند ئەژمار دەکرێت ئەگەر هات و تۆمەتبارەکە پزیشک یان دەرمانساز یان کیمیایی یان مامان یان یەکێک لە یارمەتیدەرەکانیان بێت.
٤. بە بارودۆخی دادوەریی سووککراوە ئەژمار دەکرێت هەر ئافرەتێک کۆرپەلەکەی لەبار ببات لە مەترسیی ئابڕووچوون ئەگەر هات و دووگیان بێت بە بیژۆڵەیەک، هەروەها لەو حاڵەتدا بە نیسبەت ئەوەی بۆی لەباربردووە لە خزمەکانی تا پلە دوو.

**مادده ٤۱۸:**

۱. سزا دەدرێت بۆ ماوەیەک نابێت لە ۱۰ ساڵ زیاتر بێت هەر یەکێک بە ئەنقەست بەبێ ڕەزامەندیی ئافرەتەکە کۆرپەلەکەی لەبار ببات.

لەباربردنی کۆرپەلەی لە ڕوانگەی یاساییەوە ڕێکخستووەو سزای تایبەتی بۆ دیار کردووە.

## بنەمای ماددی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە

لە پایەی ماددیی تاواندا، پێویستە تاوانبار هەستێت بە ئەنجامدانی کردارێک یان ئەنجامنەدانی کردارێک کە یاسا فەرمانی پێ کردبێت بە شێوەیەک کە بەرجەستەو هەستپێکراوو دیاربێت و لە یاسادا ناونیشانێکی بۆ دیار کرابێت. بە واتایەکی دیکە، بەس نییە کە کردارێکی تاوانکاری تەنیا لەلایەن یاساوە ڕێگریی لێ کرابێت، بەڵکو بوونی ڕواڵەتسازیی دەرەکی کردارێک کە لە

---

٢. سزا دەدرێت بە زیندانیکردن نابێت لە ١٥ ساڵ زیاتر بێت ئەگەر هات و ئەو لەباربردنە یان ئەو ئامرازەی بەکار هاتووە ڕووداوێکی لێ کەوتەوە، هەرچەندە ئەو لەباربردنە نەبووە هۆی مردنی تاوانلێکراو.

٥. بۆ تاوانبار بە بارودۆخی توند ئەژمار دەکرێت ئەگەر هات و پزیشکێک یان دەرمانسازێک یان کیمیاگەرێک یان مامانێک یان یەکێک لە یارمەتیدەرەکانیان بێت. لەسەر دادگا پێویستە فەرمان بدات پیشە یان کارەکەی بۆ ماوەیەک نابێت لە سێ ساڵ زیاتر بێت قەدەغە بکات.

**ماددە ٤١٩:** لەگەڵ لانەدان لە هەر سزایەکی توندتر کە دەقی لە یاسادا هاتووە ، سزا دەدرێت بە حەپسکردن هەر یەکێک بە ئەنقەست دەستدرێژی بکاتە سەر ئافرەتێکی دووگیان لەگەڵ زانینی ئەوەی دووگیانە بە لێدان یان بریندارکردن یان توندوتیژی یان بە پێدانی ماددەی زیانبەخش یان ئەنجامدانی هەر کارێکی دیکە کە پێچەوانەی یاسا بێت بەبێ ئەوەی ویستی لەباربردنی هەبێت بەڵام ببێتە هۆی لەباربرنی کۆرپەلەکەی.

ئەنجامی مەبەستێکی تاوانکاری یان بێمەبەست، لەلایەن بکەرەکەیەوە کە تاوانەکە لە ڕێگەی ئەوەوە خۆینیشان دەدات و جێبەجێ دەکرێت، بە مەبەستی جێبەجێبوونی کرداری تاوانکاریەکەی و سزادانی بکەرەکەی، یان ئەوانەی بەشدارن لەگەڵیدا، پێویستە. بۆ نموونە دەتوانین بڵێین کە بنەمای ماددی تاوانی کوشتن، کرداری دەرەکی بکەرەکەی نیشانی دەدات، کە بریتییە لە دەستدرێژی تاوانبار لە دژی کەسێکی تر کە مردنی ئەو کەسەی لێ دەکەوێتەوە. پێوەری بوونی پایەی ماددی، هاتنەدیی کرداری دەرەکیی مرۆڤە، لە بەرانبەردا بوونی هەر جۆرە بیرو هزرێکی ناوەکی کە هەر کەسێک هەیبێت، هەرچەندە دژی خواستە ڕەواکانی کۆمەڵگەش بێت، تا کاتێک کە شێوەیەکی دەرەکی لە واقیعدا پەیدا نەکات و ئەنجامی نەدات ئەوا سزای نییە، ئەوەی لە ویژدانی هەر کەسێکدا گوزەر دەکات، تا ئەو کاتەی لە شێوەی کردارێکی ماددی یان ئەنجامنەدانی ئەو کردارە ماددییە شێوە نەگرێت، لە سنوورو چوارچێوەی یاسای تاوانیدا جێگەی نابێتەوە (نوربها، سەرچاوەی پێشوو: ١٦٢).

پایەی ماددیی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە، هەر وەک زۆرێک لە تاوانەکانی دیکە، خۆی لە سێ بنەمای سەرەکیدا دەبینێتەوە کە بریتین لە کرداری لەباربردن (فعل الإجهاض)، ئەنجامی تاوانکاری (النتيجة الجنائية) و پەیوەندیی هۆکارییانە (العلاقة السببية).

### کرداری لەباربردن (فعل الإجهاض)

یاسادانەری عێراقی لە یاسای سزاداندا هیچ جۆرە کردارێکی تایبەتی بە شێوەیەکی حەسری دیاری نەکردووە تا لە ڕێگەیەوە بکەری تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە بەرپرسیارێتیی یاسایی وەرگرێ. دەکرێت بۆ

ئەنجامدانی کرداری لەباربردن بکەر سوود لە هەر ئامرازێک وەر بگرێت کە مەبەست پێی لەباربردنی کۆرپەلەکە بێت. بۆ نموونە ئەنجامدانی کرداری ئەشکەنجەو ئازاردان، یان سوودوەرگرتن لە دەرمان بە مەبەستی لەباربردنی کۆرپەلەکە یاخود ترساندن و ئەشکەنجەدانی خانمە دووگیان تا بەو هۆیەوە کۆرپەلەکەی لەبار بچێت، یان جاری وا هەیە خودی خانمەکە کرداری لەباربردن ئەنجام دەدات لە ڕێگەی سوودوەرگرتن و بەئەنجامگەیاندنی چەندین کردار، بۆ نموونە خۆهەڵدان لە شوێنی بەرز یاخود هەڵگرتنی شتی قورس یان سوودوەرگرتن لە دەرمانی پزیشکی و... هتد. گرنگ لێرەدا ئەوەیە کە بکەری تاوانەکە بە سوودوەرگرتن لە هەر کردارێک، ببێتە هۆی لەبارچوونی کۆرپەلەکە یان لەدایکبوونی کۆرپەلەکە پێش ئەوەی ماوەی سروشتی خۆی لە سکی دایکیدا تەواو بکات. بۆ نموونە لە مادده ٤١٧ی یاسای سزاداندا یاسادانەر دەستەواژەی (بە هەر ئامرازێک کە هەبێت)ی بەکارهێناوە کە مەبەست لێی ئەوەیە هەر وەک چۆن لەسەرەوە ئاماژەی پێ دراوە بکەری تاوانەکە دەتوانێت بۆ ئەنجامدانی کردارەکەی سوود لە هەر ئامرازێک وەر بگرێت کە بە هۆیەوە بگاتە مەبەستی خۆی کە لەبارچوونی کۆرپەلەکەیە. ئاشکرایە لە ئێستادا زۆرتر پەنا بۆ بەکارهێنانی دەرمانی پزیشکی یاخود لە ڕێگە پزیشکییەکانەوە، هەنگاوو هەوڵ بۆ لەباربردنی کۆرپەلە دەدرێت، کە بەداخەوە لەبەرنەبوونی چاودێری ورد، بە ئاشکرا لە عیادەو نۆرینگە پزیشکییەکاندا کاری لە سەر دەکرێت.

بکەری کرداری لەباربردنی ئەم تاوانە بە شێوەیەکی گشتی بە ئەنجامدانی کردارێکی ئیجابی تاوانەکە ئەنجام

دەدات، یاسادانەریش لە ماددەی ئاماژەپێکراوی سەرەوەدا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بەبەکاربردنی دەستەواژەی (بە هەر ئامرازێک کە هەبێت) ڕوونی دەکاتەوە کە مەبەستی ئەنجامدانی کرداری ئیجابیی تاوان بێت، ئەمەش بە مانای ئەوە نایەت کە ئەگەر بێت و بکەری ئەم تاوانە لە ئەنجامی ئەنجامنەدانی کردارێک کە یاسا فەرمانی پێ کردووە، ببێتە هۆی لەبارچوونی کۆرپەلەیەک ئەوا لە ڕوانگەی یاساییەوە بەرپرسیارێتیی یاسایی نەکەوێتە ئەستۆ. بۆ نموونە ئەو پەرستارەی پێویستە لە کات و شوێنی خۆیدا دەرمانی پێویست بەکار بهێنێت بۆ خانمێکی دووگیان، ئەگەر بێت و ئەو ئەرکەی لەسەر شانیەتی (پێدانی دەرمانی پێویست) بە ئەنجام نەگەیەنێت (واتە کرداری سلبیی تاوانەکە ئەنجام بدات) بە مەبەستی زیانگەیاندن و لەباربردنی کۆرپەلەی خانمە دووگیانەکە، ئەوا بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە بەرپرسیار دەبێت. یاخود بەکارنەهێنانی دەرمانی پزیشکی پێویست لەلایەن خودی خانمە دووگیانەکەوە بە مەبەستی لەباربردنی کۆرپەلەکەی، بە هەمان ڕەنگ بە تاوانەکە بەرپرسیاری دەکات.

لەبەر ئەوە، کرداری لەباربردن بریتییە لە ئەنجامدانی هەر چالاکییەک کە ببێتە هۆی کۆتایی پێهێنانی حاڵەتی دووگیانیی ئافرەت پێش کاتی سروشتی خۆی، ئەم کردارەش ببێتە هۆی مردنی کۆرپەلە لە سکی دایکیدا یاخود لەدایکبوونی بە زیندوویی پێش ئەوەی ماوەی سروشتیی خۆی تەواو بکات، جێبەجێ دەبێت (ماهر عبد شويش الدرة، ١٩٩٧: ٢١٧).

جاری وا هەیە کرداری لەباربردن دەبێتە هۆی دانانی سک پێش ئەوەی ماوەی سروشتیی خۆی تەواو بکات، پاش ئەنجامدانی کرداری لەباربردنیش کۆرپەلە

لەدایک ببێت و دوای ماوەیەک گیان لەدەست بدات، هۆکاری گیانلەدەستدانیشی کرداری لەباربردنەکە بێت، لەبەر ئەوەی توانای بەردەوامیدان بە ژیانی نابێت. لەم حاڵەتەدا ڕاجیایی لە نێوان یاساناساندا سەبارەت بەوە هەیە کە ئایا لەم حاڵەتانە بکەر بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە بەرپرسیار دەبێت یان نا؟ شێوەیەکی گشتی، کۆرپەلە لە دەرەوەی سکی دایکی لە پاش تەمەنی شەش مانگی توانای زیندوو مانەوەی هەیە، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کەمی چەند هەفتەییش بێت. بەشێک لە یاساناسان پێیان وایە بکەری کرداری لەباربردن لە وەها حاڵەتێکدا بە تاوانی لەباربردن سزا نادرێت. بەڵام بۆچوونی دروست لە نێوان ڕای تەواوی یاساناساندا ئەوەیە کە بکەر بە تاوانی لەباربردن سزا دەدرێت، بە مەرجێک ژیانی کۆرپەلەکە بەردەوام نەبێت و بمرێت، لەبەر ئەوەی کرداری لەباربردنەکە هۆکاری ئەوە بووە کۆرپەلەکە نەتوانێت بە شێوەیەکی سروشتی لە ناو منداڵدانی دایکیدا بەردەوامی بە گەشەی خۆی بدات و، دوای هاتنەدەرەوەیشی ژیانی ڕووبەڕووی مەترسی ببێتەوە (حمید السعدي. ١٩٧٦: ٥٣٤).

## ئەنجامی تاوانکاری (النتيجة الجنائية)

لە ژێر ڕۆشنایی هەر سێ مادده تایبەتەکانی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە لە یاسای سزادانی عێراقدا دەر دەکەوێت کە ئەم تاوانە یەکێکە لەو تاوانانەی کۆتکراو (مقيد)ە بە ئەنجام. ئەویش یان ئەوەتا مردنی کۆرپەلەکەیە لە ناو منداڵدانی دایکیدا یاخود هاتنەدەرەوەیەتی پێش ئەوەی ماوەی سروشتیی خۆی لە ناو منداڵدانی دایکیدا تەواو بکات.

له حاڵەتی یەکەمدا کرداری بکەری تاوانەکە دەستدرێژییە بۆ سەر مافی ژیانی کۆرپەلەکە، بەڵام له حاڵەتی دووەمدا دەستدرێژییە بۆ سەر مافی لەدایکبوونی سروشتی و گەشەی سروشتیی کۆرپەله له منداڵدانی دایکیدا (ماهر عبد شویش الدرة، سەرچاوەی پێشوو: ٢١٧).

ڕوو دەدات خانمی دووگیان بە مەبەستی ڕزگاربوون له کۆرپەلەکەی هەوڵی خۆکوشتن دەدات، ئەگەر لەباربردن هاتەدی و مردنەکەش نەهاتەدی ئەوا خانمەکه لەبارەی تاوانی لەباربردنەوه لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت و لەبارەی دەستپێکردنی خۆکوشتنەوه لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناکرێت، چونکه یاسا سزای لەسەر دەستپێکردنی خۆکوشتن دا نەناوە. بەڵام ئەگەر ئەنجامدەرەکە بە کارەکە هەڵساو لەباربردن ڕووی نەدا، ئەوا پێمان وایە دەبێت بڕیارەکانی دەستپێکردن پیادە بکرێن، واتە ئەنجامدەرەکە بە دەستپێکاری تاوانی لەباربردن دابنرێت و بڕیارەکانی دەستپێکردنی تاوانی لەسەر پیادە بکرێن (ماددەکانی ٣٠، ٣١ و٣٢ی یاسای سزادان). کەواتە، ئەگەر ئەنجامدەر دەستیکرد بە جێبەجێکردنی کردەوەکە، هیچ ڕێگرییەک نییە لەبەردەم پیادەکردنی بڕیارەکانی دەستپێکردن لەسەر ئەو تاوانانە ئەگەر بە هۆی هۆکارێک له دەرەوەی ویستی ئەو بە ئاکام نەگەیشتبێت (ماهر عبد شویش الدرة، ٢٠٠٩: ٢٧٨).

**پەیوەندیی هۆکارییانه (العلاقة السببية)**

پەیوەندیی هۆکارییانه یەکێکه لەو بنەما سەرەکییانەی تەواوکەری پایەی ماددیی هەموو تاوانەکانه، له نێویشیاندا تاوانی لەباربردنی کۆرپەله. کاتێک بکەری تاوانی لەباربردنی کۆرپەله ڕووبەڕووی سزای یاسایی

دەبێتەوە دەبێت پەیوەندیی هۆکارییانە لەنێوان کردارەکەی و ئەنجامە تاوانکارییەکەیدا هەبێت. واتە ئەو ئەنجامەی بە هۆی کردارەکەوە هاتووەتە بوون بەهۆی کرداری بکەرەکەوە بووبێت، لەم حاڵەتەیشدا بکەر ڕووبەڕووی سزای یاسایی تاوانی لەباربردن دەبێتەوە. بەڵام بە پێچەوانەوە، ئەگەر هات و ئەو ئەنجامەی کە هاتووەتە دی (لەبارچوونی کۆرپەلەکە) بەهۆی ئەو کردارەی بکەرەوە نەبووبێت، بەڵکو فاکتەری دیکە بووبێتە هۆی ڕوودانی، لەم حاڵەتەدا ناکرێت بکەر بە سزای تاوانی لەباربردن سزا بدرێت.

ڕوو دەدات لێدان لە خانمە دووگیانەکە ببێتە هۆی خوێنبەربوونێکی زۆرو لەئەنجامدا کۆرپەلەکەی پێ لەبار بچێت، هەندێک جاریش بە پێچەوانەوە ڕوو دەدات کە کرداری لەباربردنەکە هەرچەندە بەهێزیش بێت بەڵام نابێتە هۆی لەبارچوونی کۆرپەلە، بەڵکو هۆکاری دیکە وا دەکەن کە خانمە دووگیانەکە کۆرپەلەکەی پێ لەبار بچێت. لێرەدا زیاتر پەیوەندیی هۆکارییانە لەنێوان کردارەکەو ئەنجامی کردارەکە کەسانی تایبەتمەند وەک پزیشکی یاسایی یان شارەزایانی یاسایی دیاری دەکەن کە بەڵێ ئەو پەیوەندییە بوونی هەیەو نەپچڕاوە، یاخود نەخێر هیچ جۆرە پەیوەندییەکی هۆکارییانە لەنێونیاندا نییە. لەبەر ئەوە لە دادگاکاندا لە کاتی ڕوودانی حاڵەتی لەم جۆرەدا دادوەری تایبەتمەند پەنا دەباتە بەر بۆچوون و ڕای پزیشکی یاسایی یان شارەزایانی یاسایی بۆ سەلماندنی ئەوەی ئەو ئەنجامەی هەیە بە هۆی کردای بکەرەکەوە بووە یان بە هۆکاری دیکە ڕووی داوە جیا لە کرداری بکەرەکە. جاری وا هەیە کە هەرچەندە کرداری بکەری تاوانەکە بەهێزیش بێت نابێتە هۆی لەبارچوونی کۆرپەلەی خانمەکە، بەڵکو لەوانەیە پشکنینی

تایبەتی لەلایەن کەسانی پسپۆڕەوە دەری بخەن لەبارچوونەکە بە هۆی نەخۆشیی خانمەکە خۆیەوە بووەو ڕوودانی لەبارچوونێکی سروشتی (عادي) بووە. لێرەدا پەیوەندیی هۆکارییانەی نێوان کرداری لەباربردنەکە لەلایەن بکەرەکەوەو ئەنجامە تاوانییەکە نامێنێت و ناتوانرێت بکەر بە تاوانی لەباربردن سزا بدرێت.

## بنەمای مەعنەوی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەدا

بنەمای مەعنەوی، لەنێوان کتێب و نامەو یاسا سزاییەکاندا، چەندین زاراوەی جۆراوجۆری بۆ بەکار هێنراوە. بۆ وێنە، مەبەست، بنەمای ئەنقەست، نیازخراپی، پایەی ئەخلاق، پایەی دەروونی.. هتد.

بۆ هاتنەدی و جێبەجێبوونی تاوانێک، ئەنجامدان و ئەنجامنەدانی کردارێک (پایەی ماددی)، هەروەها بوونی پایەی قانوونی بە تەنیا بەس نین. ئەنجامدان یان ئەنجامنەدانی کردارێکی تاوانکاری پێویستە لە سەر خواست و ویستی بکەرەوە سەرچاوەی گرتبێت. واتە دەبێت لەنێوان کرداری ماددی و حاڵەتی دەروونیی بکەر ڕێژەیەک و نسبەیەک بوونی هەبێت تا بتوانرێت بکەر بە کەسێکی خەتاکار بناسرێت. بەرمەبنای پایەی مەعنەوی، تاوان دابەش کراوە بۆ تاوانی ئەنقەست و تاوانی نائەنقەست. ئەنقەست واتە ئەو کردارانەی بکەر لە ژێر کاریگەریی خواست و مەیلی خۆی ئەنجامیان دەدات. بێگومان کردارە ئەنقەستەکان هەموویان بە یەک ئەندازە ئەرزشمەند نین، بەڵکو تێڕوانین و مەبەستی یاسادانەر سەبارەت بەو کردارە ئەنقەستانەیە کە نیازخراپی یان تاوانکارییانەیان لە پشتەوەیە. بە واتایەکی دیکە مەبەست لە تاوانگەلێکن کە هاوتەریب لەگەڵ ئیرادەو وەسفێکی

تاوانکاری بەسترابنەوە، نەک هەموو جۆرە ویستێک بە شێوەیەکی ڕەها. هەروەها ویست، بە واتای کۆششی ویست یان خواست دێت بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی ڕوون. ئەم ئامانجەش هەمان ئەو مەبەستەی یاسادانەرە کە بە نیازخراپی (سوء النیة) تەعبیری لێ کردووە. خاڵی بەدەستهاتووی گرنگ لە جێبەجێبوونی تاواندا ئەوەیە کە ویستی ئەنجامدان لەگەڵ ویستی تاوانکاری هاوکات بێت. بەم پلەبەندییە هەر کاتێک ویستی ئەنجامدان پێش ویستی تاوانکاری بکەوێت ئەوا تاوان ڕوو نادات. هەروەها دەبێت ویستی ئەنجامدان لەگەڵ نیازخراپی بەرانبەر بێت. بەم واتایە پێویستە دادگا دڵنیا بێتەوە یان بگاتە یەقین کە بکەر سوور بووە لەسەر سەرپێچیکردنی حوکمی یاسادانەر (یاسا) و مەیل و ویستی بکەر لەسەر ئەم بنەمایە جێگیر بووە کە ئەنجامە تایبەتییە تاوانکارییەکە لە ڕەفتارەکەی خۆیەوە وەریگرتووە. لە تایبەتمەندییەکانی ئەنقەستبوونی کردارێک ئەوەیە سەرنجی بکەر لەسەر ئەنجامی کردارە تاوانکارییەکەیەتی. هەروەها بوونی نیازخراپی، واتە مەبەستی ئەنجامدانی کردارێک کە یاسادانەر قەدەغەی کردووە، هەمیشە بە تەنیا بەس نییە. هەندێک کات یاسادانەر بوونی تاوانێک بە مەبەستێکی تایبەت و ڕوون و ئاشکرا دەبەستێتەوە کە بکەر بەو مەبەستە هەوڵ و کۆششی داوە. نیازخراپی هەندێک کات دیارکراوو هەندێک کاتیش نادیارە، واتە لە زۆرێک لە بابەتەکاندا ئەم ویستە یان خواستە ڕۆشن و بەڵگەدار نییە. لە نیازخراپیی ناڕووندا بکەر ناتوانێت پێش ئەنجامدانی تاوانەکەی چۆنێتیی ئەنجامەکەی پێشبینی بکات، لە کاتێکدا لە نیازخراپیی ڕووندا بەتەواوی چۆنێتی

ئەنجامەکە بۆ بکەری تاوانەکە ڕۆشن و دیارە (لە پێگەی www.chetor.com وەرگیراوە).

تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە لە ڕوانگەی بنەمای مەعنەوییەوە، لە یاسای سزادانی عێراقدا بە تاوانێکی ئەنقەست ناسێنراوەو بارە نائەنقەستەکەی لەم یاسایەدا بوونی نییە. لەبەر ئەوە، پێویستە بکەری لەباربردنەکە یان ئەوانەی بەشدارن لەگەڵیدا (المساهم الأصلي والمساهم التبعي) بە زانینی دووگیانبوونی خانمەکەو بە مەبەستی لەباربردنی کۆرپەلەکە هەنگاو هەڵهێنن. بۆیە ئەگەر هات و خواستی لەباربردن بوونی نەبێت یان بکەر نەزانێت کە خانمەکە دووگیانە، ئەوا ناتوانرێت بە سزای لەباربردن ڕێکاری یاسایی لەبەرانبەردا بگیرێتە بەر. لەبەر ئەوە پێویستە بکەری تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە بەدنیازیی گشتی (سوء النية العام)، واتە ویستی ئەنجامدانی کردارێکی تاوانکاری بە هەر ئامرازێک کە بیەوێت، لەگەڵ بەدنیازیی تایبەتی (سوء النية الخاص) واتە ویستی گەیشتن بە ئەنجامی کردارە تاوانکارییەکەی (لەبارچوونی کۆرپەلە)ی هەبێت.

بە وردبوونەوە لە هەر سێ ماددەی تایبەت بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە لە یاسای سزادانی عێراقیدا، دەر دەکەوێت یاسادانەری عێراقی لەبارەی ئەم تاوانەوە تەنیا حاڵەتە ئەنقەستەکەی باس کردووەو، حاڵەتە نائەنقەستەکەی نەهێناوە. ئەمە یەکێکە لەو کەموکوڕی و کەلێنانەی ڕووبەڕووی یاسای سزادانی عێراقی لەبارەی ئەم تاوانەوە دەبێتەوە، چونکە زۆر حاڵەتی لەباربردنی کۆرپەلە هەیە کە بە شێوەیەکی نائەنقەست ڕوو دەدەن و لەبەر نەبوونی ماددەیەکی تایبەت بە تاوانی لەباربردنی نائەنقەستەوە ئەنجامەرانی ئەم حاڵەتانە لە سزادان بە تۆمەتی لەباربردنی کۆرپەلە قوتاریان دەبێت،

بەڵام دەکرێت بە سزای تاوانی دیکە، بۆ وێنە تاوانی لێدان یان ئازاردان، ڕێکاری یاساییان لەبەرانبەردا بگیرێتە بەر.

لە بنەمای مەعنەوی تاواندا بە سەرنجدان لە بنچینەکانی یاسای گشتی لە بکەری تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەدا، پێویستە ڕەگەزەکانی ویستی تاوانکاری بوونیان هەبن کە بریتین لە:

١- زانست (العلم)

مەبەست لەم زاراوەیە لە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەدا ئەوەیە کە بکەری تاوانەکە لە دووگیانبوونی خانمەکە ئاگادار بێت، هەر کاتێکیش بکەر لەم ڕاستییە بێئاگا بێت، هەتا ئەگەر بێت و بە شێوەیەکی ئەنقەستیش بۆ نموونە ئەزیەت و ئازاری خانمەکە بدات و ببێتە هۆی لەبارچوونی کۆرپەلەکەی، ئەوا بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەکەی بەرپرسیار نابێت، بەڵکو لە ژێر ناونیشانی تاوانی دیکە، بۆ نموونە تاوانی لێدان و ئازاردانی بە ئەنقەست، بەرپرسیارێتیی دەکەوێتە سەر شان. ئەمەیش بە مەرجێک حاڵەتی دووگیانی دیار نەبێت، خۆ ئەگەر حاڵەتەکەی ئاشکراو ڕوون بێت وەک ئەوەی خانمەکە لە مانگەکانی کۆتایی دووگیانییدا بێت، کە لەم حاڵەتەدا بە شێوەیەکی تەواو بە دیار دەکەوێت، ئەوە نەزانین و ئاگادارنەبوونی بکەر لە دووگیانیی خانمەکە شایەنی قەبوڵکردن نییەو، بکەر بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە بەرپرسیار دەبێت (عبد النبي محمد محمود أبو العينين، ٢٠٠٦: ٤٧).

ویستی تاوانکاری لە لەباربردنی کۆرپەلەدا پێویستی بە زانستی بکەری تاوانەکە هەیە بە دووگیانبوونی خانمەکە. بۆ وێنە ئەگەر پزیشکێک لە پێدانی دەرمان بە

خانمێکی دووگیان بێئاگا بێت له دووگیانبوونی و دەرمانەکە ببێتە هۆی لەبارچوونی کۆرپەلەکە، لەم حاڵەتەدا بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە بەرپرسیار نابێت. ئاگاداربوونێکی پێویست بە بوونی حاڵەتی دووگیانی لێرەدا لە حاڵەتی کردارەکەدایە، کە دەبێتە هۆی لەبارچوونی کۆرپەلەکە، بەڵام ئەگەر ئەم زانینە پاش کرداری لەباربردنەکە بێت ئەوا ویست بوونی نامێنێت (بيومي حجازي، ٢٠٠٨: ٨٤).

**٢- ویست (الإرادة)**

پێویستە بکەری تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە لە کاتی ئەنجامدانی کردارە تاوانکاریەکەیدا ویستی لەباربردنی کۆرپەلەکەو ئەنجامی کردارەکەی هەبێت، کە لەناوبردنی ژیانی کۆرپەلەکە یان کۆتایی پێهێنانی حاڵەتی دووگیانیی خانمەکەیە پێش ئەوەی ماوەی سروشتیی خۆی تەواو بکات. بەڵام ئەگەر بێت و کرداری بکەری تاوانەکە ئیرادەی نەبێت، کەواتە لێرەدا ویستی تاوانکارییش بوونی نییە. بەڵام دەکرێت لەژێر ناونیشانی تاوانی دیکە ڕێکاری یاسایی بەرانبەر بکەر بگیرێتە بەر. کرداری لەباربردن پێویستە بە ویستی بکەر ئەنجام بدرێت. لەبەر ئەوە ئەگەر بە هۆکاری دیکە، وەک هێزێکی لەدەسەڵاتدا نەبوو (قوة قاهرة) یاخود لە حاڵەتی بوونی پێویستی وەک لەباربردن بە دەرمان بێت، لەم حاڵەتەدا بەرپرسیارێتیی سزایی ناکەوێتە ئەستۆ (محمد صبحي نجم، ٢٠٠٦: ٦٢).

٣- پاڵنەری لەباربردنی کۆرپەلە (الدافع في جريمة الإجهاض)

لە شەریعەتی پیرۆزی ئیسلامدا جیاوازی لە نێوان پاڵنەرو ویست نەکراوە و، لە ڕوانگەی سزاوە لە کاتی ئەنجامدانی تاواندا، هیچ کاریگەریی نابێت، بەڵکو تەنیا لە سنووری سزا تەعزیرییەکاندا کاریگەریی دەبێت (أميرة عدلي، ٢٠٠٥: ٣٠٧).

ڕوونە کە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە بەپێی بنەما گشتییەکانی یاسا ڕوو دەدات، شێوەو جۆری پاڵنەر لە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەدا هەر جۆرێک بێت کاریگەریی نابێت، مادام بکەر ویستی ئەنجامدانی کردارەکەو بەدەستهێنانی ئەنجامی هەبێت. ئەم ئەنگیزە یان فاکتەرە کاریگەرییەکی ناوەکیی مرۆڤە، کە بکەر بەرەو ئەنجامدانی تاوان پاڵ دەنێت، بەڵام وەک بنەمای تاوانەکە ئەژمار ناکرێت (أميرة عدلي، سەرچاوەی پێشوو: ٣٢٩).

هەروەها لە ڕوانگەی جۆری ئەنگیزەی بکەری ئەم تاوانەوە، بە نیسبەت بەرپرسیارێتیی سزاییەوە جیاوازی نییە، وەک ئەوەی بکەر بە ئەنگیزەی شەرافەتمەندانە، یان لەو حاڵەتەی خانمەکە بە شێوەیەکی ناڕەوا دووگیان بووبێت، کۆرپەلەکە لەبار ببات. بەڵام لە پێگەی دیارکردنی ڕێژەی سزادا دادوەر دەتوانێت ئەو حاڵەتە وەک حاڵەتی کەمکردنەوەی سزا لەبەرچاو بگرێت و بڕیاری سزای کەمتر بۆ بکەر دەر بکات. لە یاسای سزادانی عێراقیدا بە ئاشکرا لە بڕگەی ٤ی ماددە ٤١٧ دا باسی لەو حاڵەتەی سەرەوە کردووە کە ئەگەر خانمێک بە زیناکردن دووگیان بووبێت و بە هۆکاری پاراستنی ئابڕووی، هەنگاوی بۆ لەباربردنی کۆرپەلەکەی نابێت، ئەم حاڵەتە بە بارودۆخی دادوەریی سووککەرەوە

ئەژمار دەکرێت، هەروەها هەمان بارودۆخی دادوەری، ئەوانەش دەگرێتەوە کە لە نزیکەکانی خانمەکە بن تا پلەی دووەمی خزمایەتی.

**٤- ویستی ئەگەری لە لەباربردنی کۆرپەلەدا (القصد الاحتمالي في جريمة الإجهاض)**

ویستی خراپ، یاخود ویستی تاوانکاری، دەتوانرێت لە ڕوانگەی خواستی ئەنجامی تاوانکارییەوە بۆ دوو ویستی ئەگەری (إحتمالي) و بڕیاردراو (جازم) دابەش بکرێت. لە ویستی خراپی بڕیاردراودا بکەر لە کردارە تاوانکارییەکەیدا بە شێوەیەکی مسۆگەرو خوازراو چاوەڕێی ئەنجام و ئاکامی کارەکەی دەکات. بۆ نموونە ئەو کەسەی بە مەبەستی نەهێشتنی ژیانی کۆرپەلەیەک تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەیەک ئەنجام بدات. بەڵام لە شێوەیەکدا ئەگەر بکەر ویستی ئەنجامدانی کردارە تاوانکارییەکەی هەبێت و پێشبینیی ئەنجامی کردارەکەی خۆشی بکات بەڵام خواستی ئەنجامەکەی نەبێت، ئەو کاتە ویست خراپیی ئەو بریتییە لە ویست خراپیی ئەگەری. دکتۆر گلدوزیان ئەم جۆرە لە ویست خراپی بە ویست خراپیی ناڕاستەوخۆ ناوزەند دەکات. کاتێک کە بکەری تاوان بە هیچ شێوەیەک ئەنجامی کردارەکەی نەوێت بەڵام ئەنجامەکەی بە شێوەیەکی سادە پێشبینی بکات، ئەو کات ڕووبەڕووی ویست خراپیی ئەگەری دەبینەوە (لە سایتی www.magiran.com وەرگیراوە).

لێرەدا پرسیارێک دێتە پێشەوە ئەویش ئەوەیە کە ویستی ئەگەری لە لەباربردنی کۆرپەلەدا چۆنەو ئایا هیچ بایەخ و گرنگییەکی یاسایی هەیە؟

لە نێوان یاساناسان و پسپۆڕانی بواری یاسادا بۆچوونی جیاواز هەن، بەشێکیان پێیان وایە کە ویستی

ئەگەری لە لەباربردنی کۆرپەلەدا هیچ جۆرە ئەرزشێکی یاسایی نییە، ئەم بۆچوونەی یاساناسان لە ویستی ئەگەریدا بەو مانایە هاتووە کە بکەر چاوەڕێی لەبارچوونی کۆرپەلەکە نییەو لەدوای ئەنجامدانی کردارەکەی بە لەبارچوونەکە ڕازی نابێت. وەک ئەوەی بکەر بە مەبەستی ئازاردان لە خانمی دووگیان بدات، بەڵام بە هۆکاری ئەم کردارەی کۆرپەلەکەی لەبار بچێت. لەم حاڵەتەدا بکەر بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە بەرپرسیار نابێت، بەڵکو تەنیا بە تاوانی لێدان بەرپرسیار دەبێت. چونکە بکەر چاوەڕێی بەرپرسیارێتیی ئەنقەستی لە ئەنجامی تاوانەکەی نەبووەو ویستی ئەم ئەنجامەشی نەبووە. مەگەر ئەوەی ماددەی تایبەت بە بەرپرسیاربوونی بکەر، تایبەت بەم حاڵەتە بوونی هەبێت (رؤوف عبيد، ١٩٧٤: ٢٣٢).

بۆچوونی بەشێکی دیکەی یاساناسان ئەوەیە کە دەکرێت ویستی ئەگەری لە لەباربردنی کۆرپەلەدا بابەتێکی جێ ئەرزش و گرنگیپێدراو بێت لە حاڵێکدا کە بکەر پێشبینیی ئەنجامی کردارەکەی وەک ئەنجامێکی چاوەڕوانکراو بکات و پاشان بەو ئەنجامەیش ڕازی بێت کە لە کارەکەیەوە بەدەست هاتووە، ئەوە بە تاوانی لەباربردن بەرپرسیارێتیی دەکەوێتە ئەستۆ. وەک ئەوەی خانمە دووگیانەکە هەستێت بە ئەنجامدانی وەرزشێکی قورس و زانیاریی هەبێت ئەو وەرزشکردنە زیان بە کۆرپەلەکەی دەگەیەنێت و ببێتە هۆی لەبارچوونی کۆرپەلەکەشی. یاخود کاتێک پزیشک نەشتەرگەری بۆ خانمێکی دووگیان ئەنجام بدات و، هیچ ئامادەکارییەکی پێویست لەبەرچاو نەگرێت و پێشبینی لەبارچوونی کۆرپەلەکە بە هۆی نەشتەرگەرییەکەیەوە بکات و بە ئەنجامەکەی ڕازی بێت و، لە کۆتاییدا ببێتە هۆی

لەبارچوونی کۆرپەلەکە، لەم حاڵەتەدا بکەر بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە وەک شوێنەوارێکی پێشبینیکراوی کردارەکەی بەرپرسیار دەبێت (أمیر فرج، ۲۰۰۸: ۲۵۸).

هەروەها لە حاڵەتێکدا کەسێک بە شێوەیەکی ئەنقەست تاوانی ئازاردان یان لێدان بەرانبەر خانمێکی دووگیان ئەنجام بدات، یان هەر کردارێک کە پێچەوانەی یاسا بێت و، ئەو تاوانە ببێتە هۆی لەبارچوونی کۆرپەلەکەی، تەنانەت ئەگەر بکەر ویستی لەباربردنیشی نەبێت، بە ناونیشانی شوێنەوارێکی پێشبینیکراوی کرداری لێدان یان ئازاردانە ئەنقەستەکەی، دەکرێت بکەر بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەکە بەرپرسیار ببێت، چونکە لێرەدا ویستی ئەگەری لە پایە مەعنەوییەکەیدا بە ئەندازەی پێویستە (حمودي الزبیدي، ۲۰۱۰: ۲٥٦).

بۆچوونی یاسای سزادانی عێراقی لەم بارەیەوە ڕوونەو لە مادده ٤۱۹ دا باس لەو حاڵەتە دەکات، کە ئەگەر بێت و کەسێک بەبێ ئەوەی ویستی لەباربردنی کۆرپەلەی هەبێت، کردارێک کە پێچەوانەی یاسا بێت بە ئەنقەست بەرانبەر خانمێکی دووگیان ئەنجام بدات و، بە دووگیانیی بزانێت، بە هۆی کردارەکەیشیەوە کۆرپەلەکە لەبار بچێت، ئەوا بکەر بە بەندکردن سزا دەدرێت.

## بنەمای تایبەتی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە

بە سەرنجدان لەو تاوانانەی لە یاسای سزادان و یاسا تایبەتەکانی دیکەدا خراونەتە ڕوو دەر دەکەوێت کە هەر تاوانەو بە بەراورد لەگەڵ تاوانەکانی دیکە خاسیەت و تایبەتمەندیی تایبەت بە خۆی هەیەو هەر یەکەیان بە شێوازو بنەمای تایبەتی خۆیان دێنەدی و ئەنجام دەدرێن. بێگومان لە ناو ئەو بنەما پێویستییانەی گرنگە بێنە دی لە چوارچێوەی یاسای گشتیدا، سەرەڕای مەرجە

سەرەکییەکانی هاتنەدیی هەر تاوانێک، مەرجێکی گرنگ و تایبەتیان هەیە بە ناوی پایەی تایبەت یان تایبەتمەند. تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەیش وەک زۆرێک لە تاوانەکانی دیکە بنەمایەکی تایبەت بە خۆیی هەیە کە ئەگەر ویسترا کەسێک بەم تاوانە لێپرسینەوەی یاسایی بەرانبەر ئەنجام بدرێت دەبێت لە پاڵ هەر سێ پایە سەرەکییەکانی سەرەوە کە خرانە ڕوو، ئەم پایە تایبەتەیشی تێدا بێتە دی کە ئەویش بریتییە لە بنەمای (دووگیانیی ئافرەت)، چونکە تاوانلێکراو لەم تاوانەدا بریتییە لە کۆرپەلەکە نەک خانمە دووگیانەکە. بوونی کۆرپەلە، یان دووگیانیی خانمەکە، پێویستە بۆ جێبەجێبوون و هاتنەدی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە. لەبەر ئەوە کاتێک بکەر بە مەبەستی لەباربردنی کۆرپەلەیەک کردارێکی تاوانکاری بەرانبەر بە خانمێکی دووگیان ئەنجام دەدات، یان خودی خانمەکە خۆی هەڵ دەستێت بە ئەنجامدانی ئەم کردارە، ئەوا پێویستە لەم کاتەدا خانمەکە دووگیان بێت. خۆ ئەگەر بێت و بکەر تەواوی ئەو ئامادەکارییانەی بۆ ئەنجامدانی تاوانەکەی پێویستن بگرێتە بەرو کردارە تاوانکارییەکەشی بە مەبەستی لەباربردنی کۆرپەلەیەک بە ئەنجام بگەیەنێت، بەڵام ئەگەر دەر بکەوێت خانمەکە لە بنچینەدا دووگیان نییە، ئەوا لەم حاڵەتەدا ناتوانرێت لێپێچینەوەی یاسایی بەرانبەر بکەر بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە ئەنجام بدرێت، چونکە خانمەکە دووگیان نەبووە. لەبەر ئەوە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە لە یاسای سزادانی عێراقیدا بە هاتنەدیی بنەمای تایبەتی تاوانەکە بەستراوەتەوە، کە بوونی خانمێکی دووگیانە وەک پایەیەکی گریمانەیی.

لەبارەی کاتی دووگیانیی ئافرەتەوە، یان ئەوەی لە چ قۆناغێکدا دەتوانرێت بە خانمێک بوترێت دووگیان، ئەم

بابەتە زیاتر دیوێکی پزیشکیی هەیەو لەو ڕوانگەیەشەوە دەتوانرێت بسەلمێنرێت بەڵێ خانمێک دووگیانە یان ناو کات و قۆناغی دووگیانبوونەکە لە چ ئاست و کاتێکدایە، بە تەماشاکردنی یاسای سزادانی عێراقی و هەر سێ مادده تایبەتییەکەی ئەم تاوانە، ڕوون دەبێتەوە کە بە هیچ شێوەیەک ئاماژە بە کاتی دووگیانبوون یان چ کاتێک بە خانمێک دەوترێت دووگیان ناکات، بەڵکو تەنیا ئاماژەی بە دووگیانیی ئافرەت کردووەو، ئەم بابەتەی بۆ دادگاکان بەجێ هێشتووە، تا ئەوانیش لە ڕێگای تایبەتی خۆیانەوە وەک پشکنینی پزیشکی، حاڵەتی دووگیانبوون یان دووگیاننەبوون ڕوون بکەنەوە.

دووگیانبوونی ئافرەت، بە یەکگرتنی تۆوی پیاوو هێلکەی ئافرەت (پیتاندنی) لەناو منداڵدانی خانمەکەدا دەست پێ دەکات و بە هاتنەدەرەوەی کۆرپەلە، بە شێوەی لەدایکبوونی سروشتی یان ناسروشتی، یان لەباربردن بە شێوەیەکی ئەنقەست یان نائەنقەست (لەبارچوون)، کۆتایی دێت (محمد نوري كاظم، ١٩٧٧: ١٦١). شایەنی ئاماژەپێدانە کە هیچ جیاوازییەک نییە لە نێوان ئەوەی پیتاندن سروشتی بێت یاخود دەستکرد (ئەوەی کە لە ڕێگا پزیشکییە جۆراوجۆرەکانەوە بە شێوەیەکی دەستکرد هەوڵی دووگیانبوونی خانمان دەدرێت)، یان ئەوەی دووگیانبوون بەرهەمی پەیوەندییەکی شەرعییەو لە ڕێگای پەیوەندیی ژن و مێردایەتییەوە دروست بووە، یان لە دەرەوەی ئەم پەیوەندییەوەیەو بە شێوەی ناشەرعی هاتووەتە بوون. گرنگ لێرەدا ئەوەیە خانمەکە دووگیان بێت، هەر هەنگاوێکیش ببێتە هۆی لەباربردن و کۆتایی پێهێنانی ئەم حاڵەتی دووگیانییە، بکەرەکەی ڕووبەڕووی لێپرسینەوەی یاسایی بە تاوانی لەباربردن دەکاتەوە.

لەبارەی ئەو ماف و گرنگییە یاسایی و شەرعییانەوە بۆ کۆرپەلەیەک کە هێشتا لە دایک نەبووە بڕیار دراون، بە وردبوونەوە لە بنەما پیرۆزەکانی شەریعەتی ئیسلامی و یاسا دانراوەکانی زۆربەی وڵاتانی جیهان، لە نێویشیاندا عێراق، دەر دەکەوێت کە جێگەی گرنگیپێدانەو هەر لە ناو سکی دایکیدا مافی جیاوازی بۆ بڕیار دراوەو مافەکانی پارێزراون، لەوانەیش مافی موڵکداری.

## دەستپێکردن (شروع) و بەشداریی تاوانکاریی بنەڕەتی و دواکەوتەییێتی (المساهمة الأصلیة والمساهمة التبعیة) لە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەدا

وەک چۆن پێشتر ئاماژەمان پێدا، لەباربردنی کۆرپەلە لە یاسای سزادانی عێراقیدا بە تاوان ناسێنراوەو یەکێکە لە تاوانە ئەنقەستەکان و بە ئەنجامەوە پەیوەستەو لە عێراقدا بە پێچەوانەی یاسای سزادانی وڵاتانی دراوسێوە وەک ئێران، شێوە نائەنقەستەکەی نەهاتووە، کە یەکێکە لەو کەلێنانە لە یاساکەدایەو پێویستە چارەسەر بکرێت. بە سەرنجدان لە هەر سێ ماددە تایبەتەکان بە تاوانی لەباربردن لە یاسای سزادانی عێراقیدا، دەبینین دەکرێت بکەر لەم تاوانەدا تەنیا خانمەکە خۆی دەبێت، یاخود دەکرێت کەسانی دیکە، بە ڕەزامەندی یاخود بەبێ ڕەزامەندیی خانمەکە، کردارە تاوانکارییەکە ئەنجام بدەن. لەبەر ئەوە، حوکمەکانی دەستپێکردن (شروع) و بەشداریی تاوانکاریی بنەڕەتی و بەشداریی تاوانکاریی دواکەوتەییێتی (المساهمة الأصلیة والمساهمة التبعیة) لەم تاوانەدا پێشبینی کراون. لە خوارەوەیش ڕوونکردنەوەی پێویست سەبارەت بە هەر یەکێکیان دەخەینە ڕوو:

**دەستپێکردن (شروع) لە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەدا**

ئەگەر بۆ چالاکییەکی تاوانکاری کە تاوانبار لە یەکەم قۆناغی دەستپێکردنیەوە هەنگاوی بۆ هەڵ دەهێنێت تا دەگاتە قۆناغی کۆتایی چالاکییە تاوانکارییەکەی خاڵی دەستپێکردن و کۆتایی دابنێین، دەتوانرێت قۆناغی جیاجیا لەو نێوانەدا لە یەکتر جیا بکرێتەوەو بناسێنرێن. تاوان بە ئەندێشەو پێشبینیی زیهنیی تاوانکار دەست پێ دەکات، پاشان بڕیار لەسەر ئەنجامدانی دەدات، دوای ئەوە ئامادەکردنی سەرەتایی و سەرئەنجام بە دەستپێکردنی کردارەکەی، بەئەنجام دەگەیەنرێت. هەر کاتێک تۆمەتبار لە کارە تاوانکارییەکەیدا بە مەرام و مەبەستی خۆی گەیشت، واتە بگات بە ئەنجامی کردارەکەی (جريمة تامة)، ئەو بەبێ هیچ دوودڵییەک سزا دەیگرێتەوە. بەڵام جاری وا هەیە تاوانبار لە چالاکییەکەیدا ڕووبەڕووی ڕێگری دەبێتەوەو چالاکییە تاوانکارییەکەی ڕا دەگیرێت، یان ئەوەتا هەوڵ و کۆششی زیاتر ناکات و مەرامی گەیشتن بە ئەنجامەکەی نییە. لێرەدا پرسیار ئەوەیە کە تا چ ئەندازەیەک کردارەکەی لە بەرانبەر سزای یاساییدا قەرار دەگرێت و لە چ قۆناغێکدا دەتوانرێت لێکۆڵینەوەی یاسایی بەرانبەر بگیرێتە بەر؟ ناسینەوەو زانینی قۆناغە جیاوازەکانی تاوان هاوکارە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە (أردبيلي، سەرچاوەی پێشوو: ٢١٧).

هەر کاتێک بکەر دەست بە ئەنجامدانی کرداری لەباربردن بکات، پاشان بە ویستێک لە دەرەوەی ویستی تایبەتی خۆی کردارەکەی یان ئەنجامەکەی ڕا بگرێت، بۆ وێنە بوونی هۆکارێکی دەرەکیی وەک بەرگریکردنی خانمە دووگیانەکە بەرانبەر ئەو کەسەی دەیەوێت کۆرپەلەکەی لەبار ببات، یان ئەوەتا بکەر تەواوی هەوڵ

و کۆششی خۆی بۆ لەباربردنەکە بخاتە گەڕ بەڵام کۆرپەلەکە لەبار نەچێت، لەم بارەدا بکەر بە تاوانی دەستپێکردن بە لەباربردن بەرپرسیارێتیی دەکەوێتە سەرشان (أميرة عدلي، سەرچاوەی پێشوو: ٣٤٠).

هەروەها جاری وا هەیە خانمەکە دووگیان نییە بەڵام بکەر وا پێشبینی دەکات دووگیان بێت و بە مەبەستی لەباربردنی کۆرپەلەکەی هەنگاو بۆ لەباربردن دەنێت، لەم شێوەیەدا بە لەبەرچاوگرتنی مەزهەبی شەخسی تاوان، هەر دەوڵەتێک کە لەباربردنی کۆرپەلەی لە سەر بنەمای (افتراض الحمل) وەک تاوان ناساندبێت، واتە (بوونی کۆرپەلە وەک مەرجی تایبەت ئەژمار نەکرێت)، هەر وەک ئەوەی لە ماددە ٢٤٠ی یاسای سزادانی تونسیدا هاتووە، بکەر بە دەستپێکردن بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە بەرپرسیارێتیی دەکەوێتە سەرشان. بەڵام لە یاسای بەشێک لە وڵاتانی دیکەی وەک عێراق و ئێران بوونی سکپڕی وەک مەرجی هاتنەدیی ئەم تاوانە ئەژمار کراوەو لە زۆرێک لەو پێناسە یاساییانەی بۆ ئەم کردارە کراون ئەم مەرجە ڕەچاو کراوە. لەبەر ئەوە، لە نموونەکەی سەرەوەدا، بەرانبەر تاوانی مەحاڵبوونی ڕەها ڕووبەڕووین. لێرەدا، لەبەر ئەوەی خانمەکە لە بنەڕەتدا دووگیان نییە، ناتوانین بکەر بە دەستپێکردن بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە سزا بدەین (أحمد مصطفى علي مصطفى، ٢٠٠١: ٩٩).

شایەنی وتنە کە لە یاسای سزادانی عێراقیدا هیچ ماددەیەکی تایبەت سەبارەت بە دەستپێکردن بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە نییە تا ڕوونی بکاتەوە لە بنچینەدا دەستپێکردن لەم تاوانەدا سزای لەسەر نییە، وەک یاسای سزادانی میسری کە بە ماددەیەکی تایبەت دەستپێکردن بە لەباربردنی کۆرپەلەی لە دەرەوەی

سزای یاسایی بڕیار داوە، بەڵام دەتوانرێت لە عێراقدا بەبێ بوونی هیچ جۆرە ڕێگرییەک بۆ بڕیاردان لەسەر دەستپێکردن بە لەباربردنی کۆرپەلەدا، سوود لە بنەما گشتییەکانی دەستپێکردن لە یاسای سزادانی عێراقی لە ماددەکانی ٣٠، ٣١ و٣٢[١] وەر بگیرێت.

---

[١] **مادده ٣٠:** ئەو دەستپێکردنەیە لە جێبەجێکردنی کارێک بە مەبەستی کردنی تاوانێکی گەورە یان کەتن ئەگەر هات و وەستێنرا یان شوێنەوارەکەی نەما بۆ ئەو هۆیانەی ویستی بکەر نەبوو بە هەوڵدان دادەنرێت لە کردنی تاوانەکە هەر کارێک دەر چووبێت بە مەبەستی کردنی ئەو تاوانە یان ئەو کەتنە کە ئەستەم بێت بۆ جێبەجێکردنی جا چ بۆ هۆیەک بێت پەیوەندی هەبێت بەو بابەتەی ئەو تاوانە یان بەو ئامرازەی بەکاری هێناوە بۆ کردنی، مادام بکەرەکە باوەڕی وا بێت لە دەسەڵاتی کارەکەی ئەودایە بۆ ئەو ڕووداوانەی ئاکامەکەی لەسەر بنەمای وەهم و نەزانین لە جێبەجێکردنی، و بە هەوڵدان دانانرێت تەنیا ئامادەیی نیشان دابێت لەسەر کردنی تاوانەکەو هیچ کارەکانی ئامادەکاری نییە بۆ ئەو مادام یاسا هیچ دەقێکی بە پێچەوانەی ئەوەوە نەبێت.

**مادده ٣١:** کەسێک سزا دەدرێت لەسەر هەوڵدان لە تاوان یان کەتنکردن یان سەرپێچییەکان بەو سزایانەی خوارەوە مادام دەقێکی جیاواز نییە لە یاسادا:

أ. زیندانیکردن هەتاهەتایی ئەگەر هات و سزای بڕیاردراو بۆ ئەو تاوانە لەسێدارەدان بێت.

ب. زیندانیکردن بۆ ماوەیەک زیاتر نەبێت لە ١٥ ساڵ ئەگەر هات و سزای بڕیاردراو بۆ ئەو تاوانە بەندکردنی هەتاهەتایی بێت.

ج. زیندانیکردنێک بۆماوەیەک زیاتر نەبێت لەسەر نیوەی هەرەکەمی بۆ ئەو سزا بڕیاردراوەی لەسەر ئەو تاوانە ئەگەر هات و سزاکەی زیندانیکردن کاتی بێت، ئەگەر

**بەشداریی تاوانکاری (المساهمة الجنائية) لە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەدا**

مەبەست لە بەشداریکردن لە تاواندا، یان وەک ئەوەی هەندێک بە بەشداریی تاوانکاری دەیناسێنن، ئەوەیە کە زیاتر لە کەسێک هاریکاری و بەشداری بکەن لە ئەنجامدانی تاواندا. لەگەڵ ئەوەشدا لەبەردەم حاڵەتی فرەتاوانباری (تعدد الجناة) ین کە تاوانەکە ئەنجام دەدەن. ئەمەش بەو مانایە دێت کە بۆ هاتنەدیی ئەم شێوەیە لە شێوەکانی ئەنجامدانی تاوان، پێویستە دوو مەرجی سەرەکی بێنە دی:

**یەکەم:** بوونی ژمارەیەک تاوانبار، لە یەک زیاتر بێت، لە ئەنجامدانی تاواندا. ئەمەش لە حاڵێکدا دێتە دی کە یەک کەس تاوانەکە ئەنجام نەدات، بەڵکو چەند کەسێک هاریکاریی ئەنجامدانی تاوانەکە بکەن، بەوەی هەر یەکێکیان ڕۆڵی تێیدا هەبێت. لەم حاڵەتەدا دەکرێت ڕۆڵی هەموویان وەک یەک بێت و دەشگونجێت وەک یەک نەبێت.

---

هات و نیوەی هەرەکەمی پێنج ساڵ یاخود کەمتر بێت، ئەو کاتە سزاکەی بەندکردن دەبێت بۆ ماوەیەک نابێت زیاتر بێت لەسەر نیوەی ماوەی هەرەکەمی ئەو سزایەی بۆ ئەو تاوانە بریار دراوە.

د. بەندکردن یان پێبژاردن نابێت زیاتر بێت لەسەر نیوەی هەرەکەمی بۆ سزای بەندکردن یان پێبژاردن کە بریاری لەسەر دراوە بۆ ئەو تاوانانەی ئەگەر هات و سزا بریاردراوەکە بۆ ئەو تاوانە بەندکردن یان پێبژاردن بێت.

**مادده ٣٢:** حوکمی تایبەتی لە سزاکانی پاشکۆیی و تەگبیری خۆپاراستن و تەواوکاری بڕیاری بۆ تاوانی تەواو لەسەر هەوڵدان جێبەجێ دەکرێت.

**دووەم:** یەک تاوانی ئەنجامدراو. بوونی چەندین تاوانبار بەس نییە بۆ هاتنەدیی بەشداریی تاوانکاری، بەڵکو پێویستە ئەو تاوانەی ئەنجام دراوە لە ئەنجامی بەشداریکردنی ئەو تاوانبارانە، بریتی بێت لە یەک تاوان. پێوەری یەک تاوانی بریتییە لە بوونی یەک بنەمای پایەی ماددی و مەعنەوی (علي حسين خلف وسلطان عبد القادر الشاوي، ۲۰۱۰: ۱۸۵ و۱۸٦).

بە وردبوونەوە لە هەر سێ مادده تایبەتەکان بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە، ڕوون دەبێتەوە کە دەکرێت بۆ ئەنجامدانی تاوانەکە یەک کەس یاخود زیاتر لەیەک کەس بەشداری لە ئەنجامدانیدا بکەن. بۆ نموونە، دەکرێت کەسێک یان چەند کەسێک، بە ڕەزامەندیی خانمە دووگیانەکە بێت یاخود بە بێ ڕەزامەندیی ئەو، هەستن بە لەباربردنی کۆرپەلەکەی بە شێوەیەک لەو شێوانەی لە ماددەکانی٤٧ و٤٨[1]ی یاسای سزادانا

---

**مادده ٤٧:** بە بکەری تاوان ئەژمار دەکرێت:

١. کەسێک بە تەنها یان لەگەڵ کەسێکی دیکە ئەنجامی بدات.
٢. ئەو کەسەی هاوکاریی ئەنجامدانی دەکات ئەگەر هات و کردارەکەی بە شێوەیەکی ئەنقەست لە کاتی ئەنجامدانیدا، یەکێک بێت لە کردارە پێکهێنەرەکانی تاوانەکە.
٣. کەسێک بە هەر ئامرازێک بێت پاڵ بە کەسێکی دیکەوە بنێت بۆ ئەنجامدانی کردارێکی پێکهێنەری تاوانەکە، ئەگەرهات و ئەو کەسە بەهەر هۆکارێک بێت بەرپرسیارێتیی سزایی لەسەر نەبێت.

**مادده ٤٨:** بە هاوکاری تاوان دەژمێررێت:

هاتووه، کرداری ماددیی تاوانەکە ئەنجام بدەن. لێرەدا بەپێی جۆرو شێوەی بەشداریکردنی ئەو کەسانە، جۆری بەشداریکردنەکە بۆ دادگا ئاشکرا دەبێت. بۆ نموونە، ئەگەر هات و یەکێک تەنیا بە ڕێگەی هاندان کەسێکی تر هان بدات کە کۆرپەلەکە لەبار ببات، لێرەدا کەسی هاندەر بەپێی مادده ٤٨ بە بەشداریکردنی دواکەوتەییتی (المساهمة التبعية) بەرپرسیاریی یاسایی دەکەوێتە ئەستۆ. بەڵام جاری وا هەیە کەسی بەشداریکەری تاوانەکە دەبێتە بکەری ئەسڵی، واتە هاتنەدیی بەشداریکردنی بنەڕەتی (المساهمة الأصلية)، ئەوەیش لە حاڵێکدا ڕوو دەدات بۆ نموونە کەسی بەشداریکەر لە گۆڕەپانی تاواندا تاوانی لەباربردن ئەنجام بدات، هەر وەک ئەوەی لە مادده ٤٧ی یاسای سزاداندا ئاماژەی پێ دراوە. لە یاسای سزادانی عێراقیدا وەک بنەمایەکی گشتی لە ماددەکانی ٤٨ تا ٥٤ باس لە حوکم و بڕگەکانی هاتنەدیی بەشداریکردنی تاوانکاری بە هەر دوو جۆرەکەیەوە بۆ تەواوی تاوانەکان کراوە، جگە لەوانەی بە ماددەی تایبەت بەدەر کراون، دەکرێت تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەیش، وەک زۆربەی ئەو تاوانانەی لە

---

١. کەسێک یەکێک هان بدات لەسەر ئەنجامدانی ئەوەیش بە هۆی ئەو هاندانە ڕوو بدات.

٢. کەسێک ڕێک بکەوێت لەگەڵ کەسێکی تر لەسەر ئەنجامدانی، ئەوەیش لەسەر ئەو ڕێککەوتنە ڕوو بدات.

٣. کەسێک چ چەک بێت یان ئامێرێک بێت یان هەر شتێکی تر بە بکەر بدات بۆ تاوانکردن بەکار بێت لەگەڵ زانینی، یان بە ئەنقەست یارمەتیی داوە یان بە هەر ڕێگەیەکی تر لەو کارانەی ئامادە کراوە یان ئاسانکاریی بۆ کراوە یان تەواوکراوە بۆ ئەنجامدانی.

یاسای سزاداندا هاتوون، بەشداریی تاوانکاریی تێدا بەرجەستە بکرێت.

# بەشی سێیەم

## شێوەی ئەنجامدان و سزای تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە

لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا ناساندنێکی هەمەلایەنەمان سەبارەت بە چەمکی لەباربردنی کۆرپەلەمان خستە ڕوو، لە ڕوانگەی پێناسەو جۆرو جیاوازیکردنی لەگەڵ هاوشێوەکانیداو گرنگترین ئەو تیۆرییانەی سەبارەت بەم دیاردەیە هاتوون، پاشان لە کۆتایی بەشەکەدا تیشکێکی بچووکمان خستە سەر لەباربردنی کۆرپەلە لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا. لە بەشی دووەمیشدا فۆکسمان خستە سەر بوارە یاساییەکەی تاوانەکە، لە چوارچێوەی هەر سێ ڕەگەزەکانی تاوان و بە پشتبەستن بە ماددەکانی یاسای سزادانی عێراقی لەباربردنی کۆرپەلەمان گەنگەشە کرد.

لە بەشی سێیەمدا باس لە دوو بابەتی سەرەکیی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە دەکەین، کە بریتین لە شێوەی ئەنجامدان و سزای بڕیاردراو لە یاسای سزادانی عێراقی بۆ تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە. لە کۆتایی ئەم بەشەو کتێبەکەدا ئاماژەیەک بە پاراستن و چاودێریکردنی مافەکانی کۆرپەلە دەکەین لە سیاقی پەیاننامەو ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکاندا.

## شێوەی ئەنجامدانی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو پێشکەوتنەی ئەمڕۆ لە بوارە جیاجیاکاندا کە مرۆڤایەتی پێی گەیشتووە، لە نێویشیاندا چۆنێتیی ئەنجامدانی تاوان و ئەو ئامرازە نوێ و جیاوازانەی لەلایەن ئەنجامدەرانیەوە بەکار دەبرێن، بە شێوەیەکی گشتی ڕووبەڕووی شێوازی جیاواز دەبینەوە لە چۆنێتیی جێبەجێکردنی تاوانەکاندا. تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەیش، وەک زۆرێک لە تاوانەکان، پاڵپشت بە ماددە یاساییە تایبەتەکان کە لە یاسای سزاداندا هاتوون، بە چەند شێوازێکی جۆراوجۆر ئەنجام دەدرێت، لە خوارەوە ئاماژە بە چەند جۆرێکیان دەکەین:

١- لەباربردنی سەرپشکانە (إختياري)

لەباربردنی سەرپشکانە شێوەیەکە لەو شێوانەی لە بەئەنجامگەیاندنی لەباربردنی کۆرپەلە دەگیرێتە بەر. ئەم جۆرە لە لەباربردن پاڵپشت بە ماددە ٤١٧ی یاسای سزادان دەکرێت بە دوو ڕێگەی جیاواز جێبەجێ بکرێت. ڕێگەی **یەکەمیان** لە حاڵەتێکدایە کە لەباربردنەکە لەلایەن خودی خانمە دووگیانەکەوە بە ئەنجام بگەیەنرێت، کە لەباربردنی ئیجابیشی پێ دەوترێت. لەم بارەدا ڕوون دەبێتەوە کە دەکرێت خانمەکە بە سوودوەرگرتن لە هەر ئامرازێک کردارە فیزیکییەکەی لە چوارچێوەی پایەی ماددیی تاوانەکە، بە بێبوونی هیچ جۆرە دەستێوەردانێکی دەرەکی، پێش کاتی سروشتیی منداڵبوون، کۆرپەلەکەی لەبار ببات، بۆ نموونە لە ڕێگەی هەڵگرتنی شتی قورس یاخود ئەنجامدانی وەرزشی سەخت... هتد. لەم حاڵەتەدا خانمی دووگیان بە بکەری ئەسڵی و کۆرپەلەکەشی بە تاوان لەسەرکراو دێنە ئەژمار.

شایەنی وتنە لە یاسای سزادانی هەندێک لە وڵاتان، بۆ نموونە یاسای سزادانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو، بە پێچەوانەی یاسای سزادانی عێراقی، ئەم حاڵەتەی بە ڕێگەپێدراو داناوەو هیچ جۆرە سزایەکی بۆ دیار نەکردووە (محسن خرازی، ١٩٦٦: ١١١).

ڕێگەی **دووەمیان** بە بەراورد لە گەڵ ئەوەی پێشوودا جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە تەنیا لەوەدا نەبێت کە لەباربردنەکە لە ڕێگەی کەسێکی دیکەوە بە ڕەزامەندیی خانمە دووگیانەکە ئەنجام دەدرێت، کە لەباربردنی سلبیشی پێ دەگوترێت. لێرەدا پێویستە ئەو ڕەزامەندی و ڕێگەپێدانەی خانمەکە دەیخاتە ڕوو لە ژێر هیچ جۆرە ناچارکردنێک یاخود ئیکراهێکی ماددی یان مەعنەوی یان هەڕەشەو ناچارکردنێکی نایاساییدا شێوەی نەگرتبێت، بەڵکو پێویستە بە تەواوی ئازادی و ئیرادەی خۆی ئەو ڕێگەپێدانە بخاتە ڕوو. خۆ ئەگەر هات و بە پێچەوانەوە بوو، ئەوا ئەو ڕێگەپێدانەی هیچ بەهاو ئەرزشێکی یاسایی نامێنێت و تاوانەکەش لە سیاقی ماددە ٤١٧ دا دەر دەچێت، تاوانبار بەپێی ماددە ٤١٨ی یاسای سزادان ڕێکاری یاسایی لە بەرانبەر دەگیرێتە بەر. سەبارەت بە بیرۆکەو ئایدیای لەباربردنەکە کە ئاخۆ لە کامیانەوە سەرچاوەی گرتبێت، هیچ گرفتێک ڕوو نادات کە بیرۆکەکە لەلایەن خانمەکەوە دەر بچێت یاخود ئەو کەسەی کۆرپەلەکەی بۆ لەبار دەبات.

سەبارەت بە برگەی دووەمی ماددە ٤١٧ کە ئاماژە بەو حاڵەتەی سەرەوە دەکات، یاسادانەر ئاماژەی بە حاڵەتێک کردووە کە لە ئەنجامی کردەوە تاوانکارییەکەوە مردنی خانمەکەی لێ بکەوێتەوە، هەرچەندە کۆرپەلەکەش لەبار نەچووبێت. یاسادانەر سزای بکوژی خانمە دووگیانەکەی بە سزایەک دیار کردووە کە زیاتر

نییە لە حەوت ساڵ زیندانی، ئەمەش جێگەی ڕەخنەی زۆرێک لە یاساناسانەو لەگەڵ لۆجیکی سزاو تاواندا یەک ناگرێتەوە. بۆیە پێویستە ئەو سزایە زیاد بکرێت و بە شێوەیەک بێت لەگەڵ دەرئەنجامی تاوانەکە هاوسەنگ و گونجاوتر بێت.

سەبارەت بە ڕەزامەندیی خانمە دووگیانەکە کە لە بەئەنجامگەیاندنی تاوانەکە دەخرێتە ڕوو، بە سەرنجدان لە سیاقی ئەو سێ ماددە تایبەتانەی لە یاسای سزادادا بۆ ئەم تاوانە دیار کراوان، دەبینین یاسادانەر گرنگییەکی زۆری بە ڕەزامەندی یاخود ناڕازیبوونی خانمە دووگیانەکە داوە، بەوەی ئەگەر بە ڕەزامەندیی خۆی تاوانەکە ئەنجام بدرێت سزایەکی کەمتری لە چاو ئەوەی بەبێ ڕەزامەندی ئەنجام درابێت بۆ دیار کراوە، لە کاتێکدا بەڵێ گرنگەو پێویستە کە حیساب بۆ بابەتی ڕەزامەندیی خانمەکە بکرێت، لە هەمان کاتدا بۆ دەربڕینی ڕەزامەندی کاریگەرییەکی وای لەسەر بەرپرسیارێتیی تاوانکاری دروست ناکات و لە بناغەدا تاوان لەسەرکراو بریتییە لە کۆرپەلەکەو خانمەکەش دەبێتە بکەری ئەسڵی و ئەوەی بۆشی لەبار دەبات لە چوارچێوەی ڕێژەو چۆنێتیی بەشداریکردنی، سزای بۆ دیار دەکرێت، یان ئەوەتا ئەویش دەبێتە بکەری ئەسڵی یاخود هاوبەش لە تاوانەکەدا.

سەبارەت بە بەشداریی تاوانکاری هەر وەک چۆن لە بەشەکانی پێشوودا ئاماژەمان پێدا، دەکرێت لە سنووری لەباربردنی سەرپشکانەو بە ڕێگەی دووەم، کە لەباربردنی سلبییە، بەرجەستە ببێت. بۆیە پێویستە چۆنێتیی بەشدارییەکە ئاشکرا بکرێت کە ئایا تا چ ڕێژەیەک بووە. ئەگەر بێت و لە گۆڕەپانی تاوانەکەدا بوونی هەبێت یان ئەوەی کردارێکی گرنگی ماددی کە

دروستکەری تاوانەکە بێت... هتد، بە ئەنجام بگەیەنێت ئەوا دەبێتە بکەری ئەسڵی و هەمان سزای تاوانەکە هەڵ دەگرێت. بە پێچەوانەیشەوە ئەگەر بێت و بەشداریکردنەکەی خۆی لە سنووری مادده ٤٨ی یاسای سزاداندا ببینێتەوە، وەک ئەوەی تەنیا ڕێنمایی ئەنجامدانەکە بکات، ئەوا دەبێتە هاوبەش لە تاوانەکەو سزای کەمتر بۆ دەستنیشان دەکرێت (جبرائیل البنا، ١٩٤٨: ٢١١).

٢- لەباربردنی زۆرەملێ (إجباری)

لەباربردنی زۆرەملێ بە پێچەوانەی ئەوەی پێشوو لە کاتێکدا دێتەبوون کە لەباربردنەکە بەبێ بوونی ڕەزامەندیی خانمە دووگیانەکە ئەنجام بدرێت، بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەو ئامرازو ڕێگەیەی بۆ ئەنجامدانی تاوانەکە بەکار دەهێنرێت. ئەم حاڵەتە لە مادده ٤١٨ی یاسای سزاداندا ئاماژەی پێ دراوە، بەوەی لە حاڵەتی ئەنجامدانی ئەم تاوانەداو بەبێ بوونی ڕەزامەندیی خانمەکە سزای تاوانبار زیاتر دەبێت و بە تایبەتی ئەگەر لە ئەنجامی تاوانەکەدا خانمەکە بمرێت ئەوا سزاکەی دەگۆڕرێت بۆ پازدە ساڵ زیندانی و بەتایبەت تریش ئەگەر تاوانبار خاوەن کەسایەتییەکی فەرمی بێت، ئەوا هۆکارێک دەبێت بۆ قورسبوونی سزاکەی. لەبەر ئەوە لێرەدا مەرجە خانمەکە دووگیان بێت و بەبێ ڕەزامەندیی خۆی بکەر بە شێوەیەکی ئەنقەست و بە زانستی دووگیانبوونی خانمەکە، بە هەر ئامرازێک بێت، هەنگاوی بۆ ئەم تاوانەی هەڵ گرتبێت. بەڵام ئەگەر بێت و ئەو مەرجانە بوونیان نەبێت، ئەوا ناتوانرێت کار بە مادده ٤١٨ی یاسای سزادان بکرێت.

شایانی وتنە کە یاسادانەری عێراق کارێکی دروستی ئەنجام داوە کە لە داڕشتنی ماددەکانی تایبەت بەم تاوانە جیاوازیی لە نێوان دوو حاڵەتدا کردووە، ئەوانیش بوونی ڕەزامەندی و نەبوونی ڕەزامەندییە. لە حاڵەتی بوونی ڕەزامەندیدا سزاکەی بە سزای کەتن داناوە، بەڵام لە کاتی نەبوونی ڕەزامەندی سزاکەی گۆڕیوە بۆ سزای تاوان. لە کاتێکدا یاسای سزادانی بەشێک لە وڵاتانی دنیا جیاوازییان لە نێوان ئەم دوو حاڵەتەدا نەکردووە، وەک یاسای سزادانی وڵاتی میسر لە مادده ٢٦ و وڵاتی کوێت لە مادده ١٤٧ دا (ماهر عبد شويش الدرة، سەرچاوەی پێشوو: ٨٧-٨٨).

لە حاڵەتی لەباربردنی زۆرەملێدا، کە بکەر دەبێتە هۆی لەباربردنی کۆرپەلە بەبێ بوونی ڕەزامەندیی خانمەکە، بکەر دەبێتە بکەری ئەسڵی ئەم تاوانەو خانمەکەش هیچ جۆرە بەرپرسیارێتییەکی یاسایی ناکەوێتە سەرشان، بێگومان تاوان لەسەرکراویش بریتی دەبێت لە کۆرپەلە لەباربراوەکە. دەشکرێت ئەگەر بکەرەکان زیاتر لە دوو کەس بن، بەشداریی تاوانکاری لە تاوانەکەدا بەرجەستە ببێت.

**٣- لەباربردنێك کە بە هۆی ڕووداوەکانی هاتوچۆوە ڕوو بدات**

بە سەرنجدان لە ئامارەکانی ڕووداوەکانی هاتوچۆ، کە ساڵانەو مانگانە لەلایەن دەزگا فەرمییە ناوخۆیی و دەرەکییەکانەوە ڕا دەگەیەنرێن، دەبینین ڕێژەیەکی زۆری ڕووداوی هاتوچۆ ڕۆژانە لە جیهان بەگشتی و لە نێویشیاندا کوردستان و عێراقدا ڕوو دەدەن و ئەو ڕێژەیەش ڕۆژ بەڕۆژ ڕوو لە هەڵکشانە. بۆ نموونە، لە کۆتا ڕاپۆرتی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی کە لە

حەوتی مانگی شوباتی ساڵی ٢٠٢٠ دا بڵاو کراوەتەوە ئاماژە بە مردنی ساڵانەی یەک ملیۆن و ٢٥٠ هەزار کەس و برینداربوونی ٣٠ بۆ ٥٠ ملیۆن کەسی دیکە لە جیهاندا بە هۆی ڕووداوەکانی هاتوچۆوە دەکات. لە هەرێمی کوردستان تەنیا لە نیوەی یەکەمی ساڵی ٢٠١٧ دا، ٢٠٥١ ڕووداوی هاتوچۆ ڕوویان داوە، لەو ڕێژەیەش ٣٢٧ کەس گیانیان لەدەست داوەو ٣٦٤٣ کەسیش بریندار بوون. لەم ڕێژانەدا سەرەڕای جۆراوجۆربوونی قوربانییەکان لە کەسانی گەنج و پیرو منداڵ، لە ناویاندا ڕێک دەکەوێت خانمانی دووگیانیش دووچاری لەدەستدان و لەبارچوونی کۆرپەلەکانیان ببنەوە. گرنگە لە چوارچێوەی داڕشتنی یاسا تایبەتەکان لەو بوارەدا ڕەچاوی پاراستنی مافی کۆرپەلە بکرێت، بە دانان و دیارکردنی ڕێکارو سزای تایبەت بۆ کەمتەرخەمان لەو جۆرە ڕووداوانە. ئەو تاوانانەی لە ئەنجامی ڕووداوەکانی هاتوچۆوە ڕوو دەدەن تاوانگەلێکن کە لە ئەنجامی سەرپێچیکردن لە ڕێنماییەکانی هاتوچۆوە دێنە دی. زۆربەی تاوانەکانیش لەم بوارەدا بە سیفەتی نائەنقەست ڕوو دەدەن و بکەرانیشی لە ئەنجامی ڕەچاونەکردنی ڕێنماییەکانی هاتوچۆوە ڕووبەڕووی ئەم جۆرە دەرئەنجامانە دەبنەوە، بۆیە لە سنووری یاسایەکی تایبەتدا لەژێر ناونیشانی یاسای هاتوچۆدا، ئەو جۆرە ڕووداوو تاوانانە ڕێک خراون.

ئەوەی جێی سەرنجدانە ئەوەیە لە دواین هەمواری یاسای هاتوچۆ، کە ساڵی ٢٠١٨ لە پەرلەمانی کوردستانەوە دەر چووە، کەموکوڕیی بەرچاو دەرحەق بە چاودێریکردن و پاراستنی مافەکانی کۆرپەلە بەدی دەکرێت. ئەگەر بێت و لە ئەنجامی ڕووداوێکی هاتوچۆدا ئافرەتێکی دووگیان کۆرپەلەیەک یان زیاتری لەدەست

بدات، هیچ جۆرە پاراستنێکی یاسایی لە یاسای هاتوچۆدا بۆ لەبارچوونی ئەو کۆرپەلەیە دانەنراوە، ئەمەیش یەکێکە لە زەقترین و گرنگترین ئەو ڕەخنانەی ئاراستەی ئەم یاسایە دەکرێت. هەروەها لە یاسای سزادانیشدا بارە نائەنقستەکەی نەهاتووە، بەڵکو تەنیا لە حاڵەتی ئەنقەستبوونی کردارە تاوانکارییەکەدا بەرپرسیارێتیی سزایی دەکەوێتە ئەستۆی تۆمەتبارەوە. لە حاڵەتی لەدەستچوون و یان لەبارچوونی کۆرپەلەیەک بە شێوەی نائەنقەسەت، بۆ نموونە بە هۆکاری ڕووداوی هاتوچۆ، مافی لە کیس دەچێت و یاسادانەر ناتوانێت هیچ بڕگەیەکی یاسایی چ لە یاسای سزادان یان یاسای هاتوچۆ یان هەر یاسایەکی تری بەسەردا بسەپێنێت، ئەمەش تەنیا لەبەر بوونی ئەو کەلێنە یاساییەیە کە پێویستی بە پڕکردنەوە هەیە، ئەویش بە تاوانداناني حاڵەتی لەبارچوونی کۆرپەلە بە شێوەی نائەنقەست، چ لە یاسای سزادان و چ لە یاسای هاتوچۆ.

لە حاڵەتی مردنی کۆرپەلە بە هۆی ڕووداوی هاتوچۆوە دەبینین کێشەی ڕۆنان دروست دەبێت. بۆ ئەم بابەتەش دەشێت ئەم ئەگەرانە بخەینە بەر چاو:

**یەکەم:** ڕووداوەکە تەنیا ببێتە هۆی مردنی کۆرپەلەیەک یان زیاتر.

**دووەم:** بە هۆی ڕووداوەکەوە کۆرپەلەیەک بمرێت و دەقی مادده ٢٣ی لە یاسای هاتوچۆی بەسەردا بچەسپێت.

**سێیەم:** بە هۆی ڕووداوەکەوە کۆرپەلەیەک بمرێت و دەقی مادده ٢٤ی لە یاسای هاتوچۆی بەسەردا بچەسپێت.

**ئەگەری یەکەم:** ئەگەر ڕووداوەکە تەنیا ببێتە هۆی ئەوەی دایکێکی دووگیان کۆرپەلەیەک یان زیاتری لەبار بچێت، ئەوا ئەنجامی تاوانەکە بووەتە هۆی مردنی کۆرپەلەیەک کە لە هیچ دەقێکی یاسای هاتوچۆ باسی لێوە نەکراوە. بۆیە ناتوانین ئەم ئەنجامە بە یەکێک لە دەقەکانی یاسای هاتوچۆ ڕۆنان (تکییف) بکەین.

**ئەگەری دووەم:** ئەوەیە کە دەقی ماددەی ٢٣ بەسەر ڕووداوەکەدا بچەسپێت، ئەمەش بەهۆی ئەوەی لە ڕووداوەکە کەسێک تووشی برینداریی زۆر بووبێت، یان زیانێکی ماددیی لێ کەوتبێتەوە... هتد، بەڵام دووبارە کێشەی کۆرپەلە لەبارچووەکە بەبێ چارەسەر دەمێنێتەوە، خۆ ئەگەر لە بارچوونەکە وەک نەخۆشخستنی زۆری خانمەکە هەژمار بکەین، کە دەشێت دەقی مادده ٢٣ی بەسەردا بچەسپێت، ئەوا ئەمە، جارێکی تر، چارەسەر نییە بۆ مردنی کۆرپەلەکە کە لە ئەنجامی ڕووداوەکەوەیە.

**ئەگەری سێیەم:** ئەوەیە کە ڕووداوەکە دەقی مادده ٢٤ی لە یاسای هاتوچۆی بەسەردا بچەسپێت لەبەر ئەوەی مردنی کۆرپەلەکە لە ئارادایە، بەڵام لەبەر ئەوەی منداڵەکە لە دایک نەبووە، ئەوا وەک کەسی زیندوو ئەژمار ناکرێت. بۆیە نابێت دەقی مادده ٢٣ی یاسای هاتوچۆ، کە تایبەتە بە ئەنجامی مردن بە هۆی ڕووداوی هاتوچۆوە، بەسەر ڕووداوەکە بچەسپێنریت.

دەبینین لەو ئەگەرانەی سەرەوەدا مردنی کۆرپەلە لە ڕوانگەی بەرپرسیارێتیی سزاییەوە فەرامۆش دەکرێت.

سەبارەت بە ڕای دادوەرییش لە هەرێمی کوردستان سەبارەت بە مردنی کۆرپەلە، هیچ بڕیاریکمان لەم

بارەیەوە بەدی نەکرد، تەنیا ئەوە نەبێت کە بڕیارێکی دادگای تاوانەکانی سلێمانی/٣ هاتووە (لە بەشنامەی شەرعیی لکاو بە دۆسیەکەوە باس لەوە کراوە کە خێزانی تاوانلێکراو دووگیانە، بۆیە دەبوو دادوەر لەوە دڵنیا بێتەوە کە ئەو کۆرپەلەیە ماوە یان لەبارچووەو، ئەگەر ماوە وتەی نوێنەری یاسایی بەڕێوەبەرێتی ناکامەکان وەر بگیرێت). ئەم بڕیارەش، وەک لە ناوەڕۆکەکەی دەر دەکەوێت، تەنیا بۆ قەرەبووی کۆرپەلەیە، نەک ڕۆنانی ڕووداوەکەو بەرپرسیارێتیی سزایی (د. تەها عومەر ڕەشید، ٢٠١٩: ٣١-٣٢)

٤- لێدانێك کە لەباربردنی کۆرپەلەی لێ بکەوێتەوە

ڕوو دەدات کۆرپەلەیەک بە هۆی لێدانێکەوە لەبار بچێت هەرچەندە بکەری کردارەکە هیچ ویستێکی لەباربردنی کۆرپەلەکەشی نەبووبێت. بەڵام کرداری لێدانەکەی، جا بە هەر جۆرێک بێت، بۆ نموونە لێدان بە دەست یان بە سوودوەرگرتن لە ئامرازێک... هتد، ببێتە فاکتەری لەبارچوونی کۆرپەلەیەک یان زیاتر. هەر کەسێک لە خانمێکی دووگیان بدات و عیلمی بە دووگیانبوونی خانمەکە هەبێت، بەبێ ئەوەی ویستی لەباربردنی کۆرپەلەکەی هەبێت، بەڵام لێدانەکە ببێتە هۆی لەبارچوونی کۆرپەلەکەی، لێرەدا لەبەر ئەوەی بکەر ویستی تاوانکاری (ویستی لەباربردنی کۆرپەلە)ی نەبووە ئەوە بەرپرسیارێتیی تاوانکاریی بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەی لەسەر لا دەچێت. بەڵام دەکرێت لە ژێر ناونیشانی تاوانی دیکە، بۆ نموونە تاوانی لێدانێک کە لەباربردنی کۆرپەلەی لێ بکەوێتەوە، سزای یاسایی بکەر بدرێت، بە مەرجێک ویستی لێدانی خانمەکەی هەبووبێت. ئەم شێوەیەی لە سەرەوە ئاماژەمان پێ دا لە

مادده ٤١٩ی یاسای سزادانی عێراقیدا هاتووه، یاسادانەر له حاڵەتی لەبارچوونی منداڵێک بەو مەرج و ڕێکارەی سەرەوه، بکەری ئەو جۆره لەباربردنه به سزای بەندکردن سزا دەدات.

لێرەدا گرنگه ئەوه ڕوون بێت که ناکرێت پشت به ویستی ئەگەری له تاواندا ببەسترێت، ئەوەیش لەبەر ئەوەی بکەر ویستی جێبەجێبوون و هاتنەدی لەبارچوونی کۆرپەلەکەی نییه، هەروەک ئەوەی له ماددەی ئاماژەپێکراوی سەرەوەدا هاتووه. به شێوەی ئەوەی که بکەر تەنیا ویستی لێدانی هەبووه، نەک ویستی لەباربردنیشی هەبووبێت. لێرەدا ویستی تاوانبار تەنیا دەستدرێژیکردنەو پێشبینیی ئەنجامی کردارەکەشی نەکردووەو ویستی ئەو ئەنجامشی نەبووه. بۆیه به هەمان ڕەنگ به سزای کەمتر له سزای تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەی بۆ دادەنرێت (تاڤگه عباس البستاني، سەرچاوەی پێشوو: ٩٨).

٥- لەباربردن به دەرمان

پێشترو له بەشی یەکەمدا ئاماژەمان بەم جۆره له لەباربردن کرد، وتمان که ئەم شێوەیه له لەباربردن له یاسای سزادانی عێراقی یان هیچ یاسایەکی تری تایبەتدا باسی لێوه نەکراوه، که به یەکێک لەو کەموکوڕی و کەلێنه یاساییانه دادەنرێت که پێویسته یاسادانەری عێراقی له سنووری ڕێکخستن و بەتاواندانانی لەباربردنی کۆرپەلەدا جێی بۆ بکاتەوەو هەوڵی پڕکردنەوەی بدات. بەرانبەر نەبوونی ماددەی تایبەت لەم بارەیەوه، هیچ ڕێگرییەکی یاسایی نییه که دادوەران و پسپۆڕانی نەخۆشییەکانی ژنان و منداڵبوون سوود له مادده ٦٣ی یاسای سزادان وەر بگرن، که باس له بوونی

حاڵەتی ناچاری یان پێویستی دەکات بەوەی ئەگەر بێت و کەسێک بە ناچاری پەنا بۆ ئەنجامدانی تاوانێک ببات کە خۆی هۆکاری نەبووبێت و نەتوانێت بە ڕێگەو ئامرازی دیکە خۆی قوتار بکات، ئەوا لە ڕوانگەی یاساییەوە بەرپرسیار نابێت. بێگومان لە حاڵەتی بوونی پێویستییەک دەکرێت خانمێک کۆرپەلەکەی لەبار ببات، جا خودی خۆی ئەو کارە ئەنجام بدات یان لە ڕێگەی کەسێکی ترەوە، ئەگەر بێت و بەردەوامیی دووگیانبوونییەکەی ببێتە هۆی دروستکردنی مەترسی بۆ سەر گیانی خانمەکە یان هۆکارگەلی دیکەی پێویست، بۆیە حاڵەتی چۆنێتی و هاتنەدیی ئەو ناچارییەو جێبەجێبوونی ناوەڕۆکی ماددەی ئاماژەپێکراوی سەرەوە، دادوەران و شارەزایانی یاسایی یان پزیشکی یاسایی، ڕۆڵێکی تەوەرەیی و یەکلاکەرەوە لە چۆنێتیی سوودوەرگرتن و جێبەجێکردنیدا دەبینن. جگە لە ماددە ٦٣، ساڵی ١٩٥٨ کۆمەڵێک ڕێنمایی لەلایەن وەزارەتی تەندروستیی عێراقییەوە دەرچوون کە ڕێگەیان بەم شێوەیە لە لەباربردن داوە لەسەر بنەمای کۆمەڵێک مەرج.

لەباربردن بە دەرمان یان لەباربردنی یاسایی، لە بارێکدا پەنای بۆ دەبرێت کە بەردەوامبوونی حاڵەتی دووگیانی بۆ خانمەکە مەترسیدار بێت و گیان یان تەندروستیی خانمە دووگیانەکە بە هۆکاری ئەو نەخۆشی و حاڵەتە تەندروستییە نەخوازراوانەی بۆی دروست دەبن لە مەترسیدا بێت. هەروەها شێوەیەکە کە ڕاگرتنی خولی دووگیانییەکەی، بە مەبەستی ڕێگەگرتن لە ئەنجامە تەندروستییە جەستەیی و دەروونییە نەویستراوەکانی و هەتا بە ناونیشانی پێویستی بۆ ڕزگارکردنی ژیانی خانمەکە دەخرێتە ڕوو. بۆیە ئەم

شێوەیە، تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەی لێ پێک نایەت بە هۆکاری نەبوونی ویستی تاوانکاری لەلایەن بکەرەکەیەوە.

به سەرنجدان له یاسای سزادانی بەشێک له وڵاتان، دەبینین له سنووری ڕێکخستن و بەتاواندانانی لەباربردنی کۆرپەلەدا ماددەی تایبەت سەبارەت به لەباربردنی دەرمانی و شێوەو مەرج و ڕێنماییەکانی تایبەت بەم ڕێگەپێدان و هاتنەدی ئەم شێوەیە دانراوە. بۆ نموونه له یاسای سزادانی ئێراندا (قانون مجازات اسلامی) له بەشی (تعزیرات) هکەیدا له ساڵی ١٣٧٥ ی کۆچیی هەتاویدا, سێ ماددەی ٦٢٢، ٦٢٣ و٦٢٤ی بەم تاوانەوە تایبەت کردووە. له کۆتایی مادده ٦٢٣ دا ئاماژە بەم شێوەیە له لەباربردن کراوەو، تێیدا هاتووە که ئەگەر بێت و تەواوی ئەو هەنگاوانەی بۆ لەباربردنی کۆرپەلەیەک دەگیرێنە بەر مەبەست پێیان پاراستنی ژیانی خانمەکه بێت، ئەوا لەم بارەدا بکەر بەرپرسیارێتیی سزایی لەسەر لا دەچێت. به هەمان شێوه بێجگه لەو ماددانەی سەرەوە، له ساڵی ١٣٨٤ی هەتاوی ، ماددەیەکی تری تایبەتی سەبارەت به لەباربردنی دەرمانی دەرچوێنراوە، له ناوەڕۆکی ماددەکەدا هاتووە که له پاش وەرگرتنی ڕەزامەندیی خانمه دووگیانەکەو تێپەڕبوونی چوار مانگ بەسەر دووگیانبوونیداو وەرگرتنی ڕەزامەندیی سێ پزیشکی تایبەتمەندی ژنان و ڕەزامەندیی پزیشکی یاسایی، له حاڵەتی نەخۆشبوون یان کەمئەندابوونی کۆرپەله، یاخود دروستکردنی مەترسی بۆ سەر ژیانی خانمەکە، دەکرێت ڕەزامەندی بۆ لەباربردنی کۆرپەلەکه وەر بگیرێت و بکەرانی ڕووبەڕووی سزای یاسایی نابنەوە.

پێویستە لە یاسای سزادانی عێراقیدا یاخود یاسایەکی تری تایبەتدا ڕەچاوی ئەم شێوەیە لە لەباربردن بکرێت و، بتوانرێت لە سنووری یاسادا ڕێکخستنی بەرچاوو گرنگی بۆ دابنرێت، بۆ ئەوەی ئەو حاڵەتانەی مەترسی بۆ سەر خانمەکە دروست دەکەن و پێویستیی بە دەرکردنی ڕەزامەندیی لەباربردنی کۆرپەلە هەیە دەستنیشان بکرێن، بۆ ئەوەی خەڵکانێک، یان ئەوانەی تۆمەتباری ئەم تاوانەن، بە بیانووی نەبوونی ماددەی تایبەت و بوونی جۆرێک لە ناچاری یان مەترسی خراپ لەم حاڵەتە کەڵک وەر نەگرن و نەتوانن خۆیان لە سزای یاسایی ڕزگار بکەن.

## سزای تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە

زاراوەی سزا لە زاراوەی یاساییدا پێناسەی جیاوازو جۆراوجۆری بۆ هاتووە: (سزادان بریتییە لە تۆڵەو ئاگادارکردنەوە کە بەسەر بکەری تاواندا جێبەجێ دەکرێت. چەمکی ڕەنجدان یان ئازاردان لەگەڵ چەمکی سزادان، شایەنی لێکجیاکردنەوە نین و لە واقیعدا ئازاردان و ناڕەحەتین، کە ناساندنێکی دروستی سزادانە). یان (کاردانەوەی کۆمەڵگەیە بەرانبەر بە تاوانبار).

سەبارەت بە پێناسەکانی سەرەوە دەبێت دان بەوەدا بنرێت کە زانایانی بواری یاسا لە بەدەستهێنانی ڕاستێتیی سزادان و پێناسەیەکی واقیعی و زاراوەیی، پێویست بوو کۆشش و ماندووبوونی زیاتر بکێشن. چونکە لە پێناسەکردنی سزادا، پێویستە فۆکس بخرێتە سەر لایەنە جیاوازەکانی، کە بریتین لە:

**یەکەم:** سزادان هامرِایی و هاوتەکی بە دادگەریی واقیعی هەیە، بۆیە یەکەمین دەستپێک لە ڕوونکردنەوەی سزادا ڕەچاوکردنی دادگەرییە.

**دووەم:** ئەگەر بۆ زانین، بۆ حەقیقەتی سزا بگەڕێینەوە بۆ مێژوو، تێبینی دەکرێت سزادان لە سەرەتادا بریتی بووە لە کاردانەوەی کۆمەڵگە بەرانبەر بە کردارێکی تاوانکاری، بەڵام لە دواجاردا کە کۆمەڵگە لە فۆرمێکی دیکەدا ڕێک خرایەوەو بە سیستماتیک کراو دەوڵەت دروست بوو، ئەم کاردانەوە کۆمەڵایەتییە، ڕوخسارو شێوەی یاسایی بەبەرداکراو لە سنووری یاسادا ڕێک خرا، لەبەر ئەوە دەبێت سزادان ئامانجی پەیجوریکردن بێت و ئەم ئامانجەشی دەبێت بە تەواوی لە پێناسەکردنیدا ڕەنگ بداتەوە.

**سێیەم:** دانەرو جێبەجێکاری سزا دەبێت لە پێناسەکەیدا ناو بهێنرێن.

**چوارەم:** دەبێت سنوورەکانی سزادان دیار بکرێن.

بە سەرنجدان لەو خاڵانەی سەرەوە دەتوانین سزا بەم ڕەنگە پێناسە بکەین: سزا، کۆمەڵێک بنەمای قەبوڵکراوی کۆمەڵگەن کە گرەنتی جێبەجێبوونی دادگەری ناو کۆمەڵگان و هەوڵی ڕێنوێنیی تاوانباری بنەڕەتی یان ئەگەری، پێشگیریکردن لەوانیتر لە ئەنجامدانی تاواندا، ڕازیکردنی سروشتی دادگەری ویستراوی تاوانلەسەرکراوو پارێزگاریکردن لە کۆمەڵگە دەدات، کە لە لایەن هێزی دانەری یاسایی و بە ڕێگەی دەسەڵاتی دادوەری دادەنرێت).

لەژێر ڕۆشنایی پێناسەی سزادا دەتوانین بگەینە ئەم دەرئەنجامە: (سزادان، ئازارێکە کە دادوەر بە هۆکاری ئەنجامدانی تاوان، بە ناونیشانی نەفرەتی کۆمەڵگە لە کردارێکی تاوانکاریدا بەسەر ئەو کەسەدا کە پابەند

نەبووە پێوەی بەپێی یاسا دیار دەکات. ئەو ئازارەی زیان بە مافێک لە مافەکانی بکەردا دەگەیەنێت، نابێت ئامانجی سزادانەکە پایەماڵ بکات. ئامانجی سزا چاکسازیی تاوانبارو پارێزگاریکردن لە کۆمەڵگەو هێنانەدیی دادگەرییە. ئازار ئامرازی گەیشتنە بەو ئامانجە گەورەیە. ئەو سزایەی دادوەر دەستنیشانی دەکات، لەو سنوورەدایە کە یاسا دیاری کردووە. سزا گرەنتی جێبەجێبوونی بنەماگەلێکە کە پەیوەندیدارن بە سیستمی گشتییەوەو باقی ئامرازەکانی دیکە بە باشترین شێوە گرەنتی دەکات. سزا، کەسییەو بۆ هەمووان یەکسانە) (لە پێگەی www.kazemlaw.blogfa.com وەر گیراوە).

یاخود، بریتییە لەو سزایەی یاسای تاوانی بڕیاری لەسەر داوە بۆ بەرژەوەندیی کۆمەڵگەو جێبەجێکردنی بڕیاری دادگا، بەسەر ئەوەی ئەنجامدانی تاوانێکی بەسەردا دەسەلمێنرێت جێبەجێ دەکرێت بۆ ڕێگریکردنی لە ئەنجامدانەوەی تاوان لەلایەن خودی تاوانبارەکەوە یان باقیی هاوولاتیان (علي حسين الخلف وسلطان عبد القادر الشاوي، ٢٠١٠: ٤٠٥).

تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە وەک تەواوی ئەو تاوانانەی لە یاسای سزادانی عێراقی و یاسا تایبەتەکانی دیکەدا هاتوون، یاسادانەر بەپێی ئەندازەو گەورەیی و بچووکی تاوانەکان و مەترسییان بۆ سەر سەقامگیری کۆمەڵگەو سیستمی گشتی سزای گونجاوو جۆراوجۆری بۆ دیار کردوون، سەرەڕای بوونی کەلێن و ڕەخنەی یاسایی سەبارەت بە سووکی یان قورسیی ئەو سزایانەی بۆ بەشێک لە تاوانەکان دانراوە.

یاسادانەری عێراقی لە یاسای سزاداندا سەبارەت بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە سێ جۆر لەباربردنی دیار کردووە، کە بریتین لە:

١. لەباربردنی کۆرپەلە لە ڕێگەی خانمە دووگیانەکەوە بە هەر ئامرازێک بێت.
٢. لەباربردنی کۆرپەلە لەلایەن کەسێکی دیکەوە بە ڕەزامەندیی خانمەکە خۆی.
٣. لەباربردنێک لەلایەن کەسێکەوە کە ڕەزامەندیی خانمە دووگیانەکەی لەگەڵ نەبێت.

بۆ هەر یەکێکیش لەو حاڵەتانە سزاو ڕێکاری جیاوازی دیار کردووە. هەروەها حاڵەتەکانی بارودۆخی سووککردنەوەو قورسکردنی سزا، تایبەت بەم تاوانە هاتوون. لە چەند بڕگەی دادێت هەر یەکێک لەو حاڵەتانە سەرەوە ڕوون دەکەینەوە.

**سزای لەباربردنی کۆرپەلە لەلایەن خودی خانمە دووگیانەکەوە**

لە شێوەی یەکەمی ئەو ڕێکارە سزاییەی بەرانبەر تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە، کە یاسادانەری عێراقی لە یاسای سزاداندا هێناویەتی بریتییە لە سزای بەندکردن یان پێبژاردن، لە حاڵێکدا ئەگەر بێت و خانمە دووگیانەکە خۆی هەستێت بە لەباربردنی کۆرپەلەکەی بە سوودوەرگرتن لە هەر ئامرازێک. ئەم سزایە لە سیاقی مادده ٤١٧ بڕگەی یەکەمدا ئاماژەی پێ دراوە، بریتییە لە ساڵێک بەندکردن و پێبژاردنێک بە بڕی دوو سەدو بیست و پێنج هەزار (٢٢٥,٠٠٠) دینار یان بە یەکێک لەو دوو سزایە. بە سەرنجدان لە فەلسەفەی بەتاوانداناتی لەباربردنی کۆرپەلەو ئەو ئامانجە باڵایانەی وایان کردووە لە کۆمەڵگەدا بە تاوان دابنرێت و ڕێگری یاسایی

لێ بکرێت و، ئەو دەرئەنجامەی بە هۆی ئەم تاوانەوە دێتە دی کە لە ناوبردنی کۆرپەلەکەیە، دەبینین ڕێژەو ئاستی سزا تاوانییەکەی کەمەو بە بۆچوونی زۆرێک لە لێکدەرەوە یاساییەکانی بواری یاسای تاوانی پێویستە ڕێژەکەی زیاد بکرێت تا لەگەڵ ئەنجامی تاوانەکە هاوسەنگ بێت، لەبەر ئەوەی مانەوەو پاراستنی کۆرپەلە جگە لەوەی کە مافی سروشتی کۆرپەلەکەیە وەک هەموو بوونێک لە داهاتوودا بەردەوامی بە ژیانی خۆی بدات، لەگەڵ ئەوەشدا مافی کۆمەڵگەشە لە درێژەدان و نەشونماو هەراشبوونی لە داهاتوودا. ئەم مافە تەنیا مافێک نییە کە خانمەکە خاوەندارێتیی بکات و بە ئارەزووی خۆی بڕیاری وازلێهێنانی بدات.

**سزای لەباربردنی کۆرپەلە لەلایەن کەسێکەوە بە ڕەزامەندیی خانمە دووگیانەکە**

بە هەمان ڕەنگ سزای بەندکردن و پێبژاردن وەک ڕێکارێکی سزایی بەرانبەر ئەنجامدنی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە لە یاسای سزاداندا گیراوەتە بەر بۆ ئەو کەسەی بە ڕەزامەندیی خانمە دووگیانەکە هەڵ دەستێت بە ئەنجامدانی ئەم تاوانە. بە سەرنجدان لە بڕگەی یەکەم و دووەمی مادده ٤١٧ی یاسای سزادان ڕوون دەبێتەوە ئەگەر بێت و لە حاڵێکدا کەسێک بە ڕەزامەندیی خانمێکی دووگیان هەستێت بە لەباربردنی کۆرپەکەی، بە سوودوەرگرتن لە هەر ئامرازێک، ئەوا بەپێی ئەو دەرئەنجامەی کە لە کردارە تاوانکارییەکەوە بەدەست دێت، یاسادانەر لەدوو ئاستدا بەپێی مادده یاساییەکە سزای بۆ بڕیار داوە. لە **ئاستی یەکەمیاندا** ئەگەر بێت و لە ئەنجامی کردارە تاوانکارییەکەدا تاوانباران بە مەبەست و دەرئەنجامەکەیان گەیشتن کە بریتییە لە

لەبارچوونی کۆرپەلەکە، ئەوا هەمان سزای ساڵێک بەندکردن و پێبژاردنی بڕی دوو سەدو بیست و پێنج هەزار (٢٢٥,٠٠٠) دیناری بۆ دیار کراوە. بەڵام لە **ئاستی دووەمیاندا** ئەگەر بێت و لە ئەنجامی کردارە تاوانکارییەکەدا مردنی تاوانلێکراوی لێ بکەوێتەوە هەرچەندە لەباربردنی کۆرپەلەکەش تەواو نەبووبێت، ئەوا سزای تاوانبار بریتی دەبێت لە زیندانیکردن بۆ ماوەیەک کە لە حەوت ساڵ زیاتر نەبێت.

ئەگەرچی ڕێژەی ئەم سزایە بە بۆچوونی بەشێک لە یاساناسان سووکە، چونکە هیچ هاوسەنگییەکی لەگەڵ ئەنجامی تاوانەکە نییەو، کردارە تاوانکارییەکەی کوشتنی خانمەکەو کۆرپەلەکەشی لێ کەوتووەتەوە، لە کۆتاییدا تۆمەتبار حەوت ساڵ زیندانیکردن سزای بۆ دیار کراوە. لەم حاڵەتەدا کێشی ئەم سزایە لەگەڵ ئەنجامی کردارە تاوانکارییەکە هاوسەنگ نییەو، ئێمە دەزانین ڕەزامەندی کرداری تاوانکاری ڕێگەپێدراو ناکات، بە تایبەتی لە مافی ژیان یان مافی سەلامەتیی جەستەیی، لەبەر ئەوە بۆچی لەم حاڵەتەدا بڕیاری ئەم جۆرە لە ئاسانکاری بۆ بکەر بدرێت؟ پێویستە کێشی ئەم سزایە زیاد بکرێت لەسەر بنەمای ئەوەی کە کوشتنی ئەنقەستە (ماهر عبد شويش الدرة، سەرچاوەی پێشوو: ٢١٩).

## سزای لەباربردنی کۆرپەلە لەلایەن کەسێکەوە بەبێ ڕەزامەندیی خانمە دووگیانەکە

بەدەر لەو دوو حاڵەتەی سەرەوە، ڕوو دەدات تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە لەلایەن کەسێکەوە بەبێ بوونی ڕەزامەندیی خانمە دووگیانەکە ئەنجام بدرێت، جا ئەو کەسە مێردی بێت یاخود لە کەسە نزیکەکانی بێت، یان

هەر کەسێکی دیکەو بە سوودوەرگرتن بێت لە هەر ئامرازێک کە بکەر پەنای بۆ ببات.

ئەم حاڵەتە لە چوارچێوەی سیاقی مادده ٤١٨ی یاسای سزاداندا هاتووە کە لە دوو بڕگەی جیاوازدا یاسادانەر ئاماژە بە دوو جۆری سزا دەکات.

لە **بڕگەی یەکەمی** ماددەکەدا یاسادانەر سزای دە ساڵ زیندانیکردنی بۆ بکەری ئەم تاوانە داناوە ئەگەر بێت و بە سوودوەرگرتن لە هەر ئامرازێک و بە بێ ئەوەی ڕەزامەندیی خانمە دووگیانەکە لە گۆڕێ بێت، هەستێت بە لەباربردنی کۆرپەلەکەی. لێرەدا دەبینین یاسادانەر گرنگییەکی زۆری بۆ حاڵەتی ڕەزامەندیی خانمە دووگیانەکە داناوە، بەوەی کە لە دوو حاڵەتەکەی سەرەوە ئەگەر بێت و لەکاتی ئەنجامدانی تاوانەکەدا خانمەکە ڕازی بێت بە لەباربردنی کۆرپەلەکەی، ئەوا یاسادانەری عێراقی سزای پێبژاردن یاخود بەندکردن کە زیاتر نییە لە ساڵێک، بۆی بڕیار داوە. بەڵام لەم حاڵەتەدا لەبەر نەبوونی ڕەزامەندیی خانمە دووگیانەکە، یاسادانەری عێراقی جۆری سزاکەی لە سزای کەتنەوە گۆڕیوە بۆ سزای تاوان و کردوویەتی بە دە ساڵ زیندانیکردن. گرنگە بوترێت بوونی ڕەزامەندیی خانمەکە لەم تاوانەدا ناکرێت بەو شێوە زەق و گەورەیە لە ڕوانگەی سزاوە زۆر گرنگیی پێ بدرێت و پێداگیریی لێ بکرێت، چونکە وەک پێشتر وتمان مانەوەو پاراستنی ژیانی کۆرپەلە مافی گشتیی کۆمەڵگەو خودی کۆرپەلەکەشی تێدایە کە درێژەدانیەتی بە ژیانی سروشتیی خۆی لە داهاتوودا. بۆیە تەنیا مافی خانمەکەی بەسەرەوە نییە تا دەستبەرداری بێت و، ڕەزامەندییش کرداری تاوانکاری ڕێگەپێداو ناکات. ناڵێین نابێت بە هیچ شێوەیەک گرنگی بە ڕەزامەندیی خانمەکە

نەدرێت، بەڵام لە بەرانبەریشدا بوونی جیاوازییەکی زۆری ڕێکاری یاسایی و ڕێژەی سزاکە، بە بوون یان نەبوونی ڕەزامەندییەوە، حاڵەتێکی نۆرماڵ نییە. گرنگە جۆرێک لە هاوسەنگی لە نێوان ئەم دوو حاڵەتەدا بکرێت لە پێناوی ڕێگریکردن لە فراوانبوونی ڕێژەی ڕوودانی ئەم تاوانەو پاراستنی پڕۆسەی منداڵخستنەوە لە کۆمەڵگەداو دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی تەندروست.

لە **برگەی دووەمی** مادده ٤١٨ی یاسای سزاندان یاسادانەر سزای تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەی قورس کردووە بۆ پازدە ساڵ زیندانی لە حاڵێکدا ئەگەر بێت و بە هۆکاری بە ئەنجامدانی کرداری لەباربردنی کۆرپەلەکە ژیانی خانمە دووگیانەکە لەدەست بچێت، هەرچەندە لەباربردنەکەش تەواو نەبووبێت. لێرەشدا بە هۆکاری نەبوونی ڕەزامەندیی لەباربردنی کۆرپەلەکە یاسادانەر سزای حەوت ساڵ زیندانیکردنەکەی کردووە بە پازدە ساڵ زیندانیکردن ئەگەر بێت و ژیانی تاوانلێکراو، واتە خانمەکە، لەدەست بچێت. چونکە سەرەڕای ئەوەی کە تاوانی لەباربردنەکە دێتە دی لەگەڵ ئەوەشدا خانمەکە ژیانی لەدەست دەدات، بۆیە سزاکەی قورس کراوە.

یاسادانەری عێراقی سزایەکی تری لە یاسای سزاداندا سەبارەت بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە لە مادده ٤١٩ دا هێناوە، کە سزای بەندکردنە، بەبێ ئەوەی چەندێتیی ئەم بەندکردنە دیار بکات، تەنیا ئەوە نەبێت کە ئاماژەی پێ داوە نابێت ڕێژەی بەندکردنەکە تێ بگیرێت لەگەڵ سزایەکی قورستر کە لە یاسادا هاتبێت. بێگومان هۆکاری ئەمەش ئەوەیە کە بکەر لە کاتی ئەنجامدانی کردارە تاوانکارییەکەیدا ویستی لەباربردنی کۆرپەلەکەی نییە، سەرەڕای ئەوەی کە کردارەکەی بە شێوەی

ئەنقەست ئەنجام دەدات و زانستیشی بە دووگیانیی خانمەکە هەیە.

**بارودۆخی قورسکردن لە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەدا (الظروف المشددة في جريمة الاجهاض)**

به بوونی چەند مەرج و حاڵەتێکی تایبەت، جاری وا هەیە یاسادانەر وای بۆ دەچێت کە سزای بڕیاردراو لە حاڵەتی ئاساییدا بۆ کردارێکی تاوانکاری گونجاو نییەو، وا پێویست دەکات بڕیار لەسەر رێکاری یاسایی و سزایی توندتر لەگەڵ کردارەکەو تۆمەتباردا بڕیار بدات. لەبەر ئەوە بە بەرجەستەبوونی چەند هۆکارێک بڕیاری دانانی چەند ماددەیەکی توندکردنی سزای داوە، بۆیە لە کاتی دیارکردنی سزایەک بۆ کردارێکی تاوانکاری بە بەرجەستەبوونی فاکتەرەکانی قورسکردنی سزا یان ئەوەتا سزای بڕیاردراو لەلایەن دادوەرەوە لە بەرانبەر کردارە تاوانکارییەکەدا لایەنی زۆری سزاکە تێپەڕ دەکات، یان گۆڕانکاری بەسەر جۆری سزاکەدا دەهێنێت بۆ سزایەکی قورستر، وەک گۆڕینی لە سزای کەتنەوە بۆ سزای تاوان.

هۆکارەکانی قورسکردنی سزا کۆمەڵێک بارودۆخن کە یاسادانەر دیاری کردوون و دادوەر بە جێبەجێبوون و هاتنەدیی هەر یەکێکیان، بە لایەنی زۆرەوە یان بە قورسترین سزا کە لە یاسادا دیار کراوە بۆ تاوانەکە بڕیار دەدات. ئەو بارودۆخانەش ئەگەر پەیوەندیدار بن بە تاوانێکی تایبەتەوە، ئەوا دادگا لەسەریەتی سزاکەی توند بکات. هەروەها ئەگەر پەیوەندیدار نەبن بە تاوانێکی تایبەتەوە، بەڵکو بارودۆخی گشتی بن، کە هەر کاتێک لەگەڵ تاوانێکدا بەراورد کران ئەوا بە مەرجی توندکردنی سزای ئەو تاوانە ئەژمار دەکرێت، بۆیە لەم حاڵەتەدا

دادوەر بە حوکمی یاسا ناچار دەبێت سزای تاوانەکە قورس بکات بەو کێشەی لە یاساکەدا دیار کراوە (اردبیلی، ١٣٩٤: ١٧٠).

یان بارودۆخی قورسکردن بارودۆخگەلێکن کە یاسادانەر دیاری کردوون و پەیوەندیدارن بە تاوان یان تۆمەتبارەوە، کە پێویست بە توندکردنی بە لایەنی زۆری ئەو سزایانە دەکات کە لە یاسادا بڕیاریان لێ دراوە (علي حسين الخلف وسلطان عبد القادر الشاوي، سەرچاوەی پێشوو: ٤٤٤).

بە شێوەیەکی گشتی لە زانستی سزاو تاواندا دوو جۆر بارودۆخی قورسکردنی سزا هەن، کە بریتین لە بارودۆخی قورسکردنی گشتی (ظروف مشددة عامة) و بارودۆخی قورسکردنی تایبەتی (ظروف مشددة خاصة).

### یەکەم: بارودۆخی قورسکردنی گشتی (ظروف مشددة عامة)

بریتین لەو بارودۆخانەی لە یاسای سزاداندا باسکراون، واتە یاسادانەر لە بەشی یاسای سزادانی گشتی هێناونی کە بەسەر تەواوی تاوانەکاندا جێبەجێ دەکرێن و دادوەر لە حاڵەتی بوونی ئەم بارودۆخانەدا، ناچار دەبێت بەپێی یاسا جێبەجێیان بکات (حسين شيخ محمد الباليساني، ١٩٩٨: ٣١٥) بۆ نموونە، لە حاڵەتی دووبارە ئەنجامدانەوەی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە، واتە دوای ئەوەی کەسێک بەم تاوانە سزا بدرێت پاشان جارێکی دیکە بە ئەنجامدانەوەی تاوانەکە تۆمەتبار بکرێت، دادوەر دوای یەکلابوونەوەو سەلماندنی تۆمەتی ئەنجامدانی ئەم تاوانە، ناچارە سزای توندتر بەپێی ماددە تایبەتەکان بەسەر ئەو کەسەدا بڕیار بدات.

دووەم: بارودۆخی قورسکردنی تایبەتی (ظروف مشددة خاصة)

بریتین لەو بارودۆخانەی یاسادانەر تایبەتی کردوون بە تاوانێکی تایبەتەوەو پەیوەندییان بە تەواوی تاوانەکانەوە نییە، بە پێچەوانەی بارودۆخی قورسکردنی گشتییەوە، بەسەر تەواوی تاوانەکاندا جێبەجێ ناکرێن، بەڵکو پەیوەندیدارن بە بەشێک لەو تاوانانەی یاسادانەر بە ماددەی تایبەت دیاری کردوون، وەک تاوانی دزیکردن لە شەودا (أکرم نشأت إبراهیم، ١٩٩٨: ٣٥٣) یان تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە لەلایەن پزیشک یان مامانەوە.

پۆلێنبەندییەکی تری بارودۆخی قورسکردنی سزا بریتییە لە بەشکردنی بۆ **بارودۆخی قورسکردنی ماددی،** کە پەیوەندیدارە بە تاوانەکەو چۆنێتیی ئەنجامدانی و، **بارودۆخی قورسکردنی کەسی،** کە ئەم جۆرەشیان پەیوەندیدارە بە خودی کەسی تۆمەتبارەوە نەک بە تاوانەکەوە (حسین شیخ محمد البالیساني، سەرچاوەی پێشوو: ٤٤٦).

بە سەرنجدان لە ماددە تایبەتەکان بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە لە یاسای سزادانی عێراقیدا ڕوون دەبێتەوە یاسادانەر سەبارەت بەم تاوانە، سەرەڕای بارودۆخە گشتییەکان، دوو جۆر لە بارودۆخی قورسکردنی سزای هێناوە، کە بریتین لە بارودۆخی قورسکردنی سزا بە هۆکاری ئەنجامی تاوانەکەوە (بارودۆخی قورسکردنی ماددی) و، بارودۆخی قورسکردنی سزا بە هۆکاری کەسێتیی تایبەتی ئەنجامدەری تاوانەکەوە (بارودۆخی قورسکردنی کەسی). لە خوارە تیشک دەخەینە سەر هەر یەکێکیان.

**باروودۆخی قورسکردنی سزا، بە هۆکاری دەرئەنجامی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە (الكيفيات المشددة بسبب نتيجة جريمة الاجهاض)**

ئەم شێوەیە لە باروودۆخی قورسکردنی سزا، کە باروودۆخی قورسکردنی ماددییشی پێ دەوترێت، پەیوەندیدارە بە پایەی ماددیی تاوانەوەو لە سنووررو دەرئەنجامی کردارە ماددییە تاوانکارییەکەوە هەڵسەنگاندنی بۆ دەکرێت. یاسادانەری عێراقی لە بارەی پەیوەندیی ئەم باروودۆخەو چۆنێتیی هاتنەدیی لە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەدا، لە هەر دوو ماددەی ٤١٧ و ٤١٨ی یاسای سزاداندا باسی لێ کردووە.

لە ماددەی ٤١٧ بڕگە ٢ دا ئاماژە بەوە دەکات کە ئەگەر بێت و لە ئەنجامی کرداری لەباربردنی کۆرپەلەدا تاوان لەسەرکراو، واتە خانمە دووگیانەکە، گیان لەدەست بدات، هەرچەندە لەباربردنەکەش تەواو نەبووبێت، ئەوا یاسادانەر بە هۆکاری ئەم دەرئەنجامە بەدەستهاتووەو لە سنووری تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەدا، سزای تاوانباری قورس کردووە بە زیندانیکردن کە زیاتر نەبێت لە حەوت ساڵ. بە واتایەکی دیکە سزای ئەم تاوانە لەم ماددەیەدا لە بنچینەدا بریتییە لە سزای تاوانی کەتن (جنحة)، بەڵام یاسادانەر لە ژێر ڕۆشنایی دەرئەنجامی کرداری ماددیی تاوانەکە، سزاکەی گۆڕیوە بۆ تاوان سزای تاوان/ زیندانیکردن.

بە هەمان شێوە سەبارەت بە ماددە ٤١٨ بڕگەی ٢، بە هۆکاری گیانلەدەستدانی خانمە دووگیانەکەو ئەنجامی کرداری ماددیی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەوە، سنووررو ڕێژەی سزای تاوانباری ئەم دەرئەنجام و تاوانەی لە دە ساڵەوە قورس کردووە بۆ پازدە ساڵ زیندانیکردن. بێگومان ئەم حاڵەتەش وەک ئەوەی لە ماددە ٤١٧ دا

ئاماژەمان پێ دا، یاسادانەر ئەنجامی بەدەستهاتوو لە ئەنجامی کرداری ماددی تاوانەکەوە، کە گەورەترو ترسناکترە ئەویش گیانسپاردنی خانمە دووگیانەکەیە، هاتووە سزاکەی قورس کردووە بۆ پازدە ساڵ زیندانیکردن، جگە لەوەش لەباربردنەکەی بەبێ بوونی ڕەزامەندیی خانمەکە ئەنجام داوە.

بێگومان گرنگە لە فەلسەفەی دانانی سزا بۆ هەر تاوانێک لەلایەن یاسادانەرەوە تا ئاستێکی گونجاو ڕەچاوی جۆرێک لە هاوسەنگی لە نێوان گەورەیی و بچووکیی تاوانەکە بکرێت لەگەڵ ڕێژەی ئەو سزایەی بۆ ئەو تاوانە دیار دەکرێت، بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانجی ڕێکخستن و بەرەو پێشبردنی پەیوەندیی نێوان تاکەکان، کە گەشاوەترین و گەورەترین ئامانجە کە لە دانانی هەر یاسایەکدا هەوڵی بۆ بدرێت.

**بارودۆخی قورسکردنی سزا بە هۆکاری کەسێتیی بکەر لە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە (الكيفيات المشددة بسبب شخصية المجرم في جريمة الاجهاض)**

شێوەیەکی دیکەیە لە بارودۆخی قورسکردنی سزا، کە قورسکردنی کەسییشی پێ دەوترێت. ئەم جۆرە پەیوەندیدارە بەو کەسایەتییە تایبەتەی تۆمەتباری تاوانەکە خاوەنداریێتیی دەکات. بێگومان لە پرۆسەی ئەنجامدانی تاواندا کەسی بکەرو تۆمەتبار قەتیس نەکراوە لەوەی کە پێویستە خاوەنداریێتیی چ جۆرە کەسایەتییەک بکات، بەڵکو لە پرۆسەو ژینگەی ئەنجامدانی تاواندا چەندین جۆرو شێوەی جیاواز لە کەسێتیی بکەرانی تاوانەکان بوونیان هەیە. ئەوەی گرنگە لێرەدا تیشکی بخرێتە سەر لەبارەی ئەو کەسانەوەیە کە خاوەنداریێتیی جۆرێک لە کەسێتیی تایبەتی دەکەن و لە

ئەنجامدانی تاواندا تێوە دەگلێن، وەک ئەو کەسانەی کارمەندی دەوڵەتن و سیفەتی فەرمییان هەیە. لە کاتی ئاراستەکردنی تۆمەتی ئەنجامدانی تاوانێک و سەلماندنی تۆمەتەکەدا بەسەر ئەم جۆرە کەسانەدا، یاسادانەر، بە هۆکاری خاوەندارێتیی ئەو کەسێتییە تایبەتەیان، بڕیاری قورسکردنی سزای بۆ داون. ئەمەیش لەبەر ئەوەی ئەم جۆرە تاوانبارانە لەبەر کەسێتی و ئەو پیشە فەرمییەی لە ناو حوکمڕانیی دەوڵەتدا هەیانە ڕێکارو دەرفەتی ئەنجامدانی تاوانیان لەلا ئاسانترە وەک لەلای کەسانی ئاسایی کۆمەڵگە. هەروەها قۆستنەوەی وەزیفەی گشتی بۆ ئەنجامدانی تاوان و دواجار زیانگەیاندن بە سیستمی گشتی لە پرۆسەی حوکمڕانیدا، هۆکارێکی دیکەو گرنگە کە بە هۆیەوە یاسادانەر دەیکاتە فاکتەرو پاڵنەرێک کە بە شێوەیەکی توندترو جیاوازتر هەڵسوکەوت بکات و ئاستی سزای بەرزتریان بۆ دیار بکات.

یاسادانەری عێراقی لەو هۆکارانەی دەبنە فاکتەر بۆ قورسکردنی سزا لە ماددە ١٣٥[1]ی یاسای سزاداندا

---

[1] ماددە ١٣٥: لەگەڵ وازنەهێنان لەم بارودۆخە تایبەتییە کە یاسا دەقی بۆ داناوە لەسەر توندکردنی سزادان، ئەوانە بە بارودۆخی قورسکردن دادەنرێت:

١. کردنی تاوان بە هاندانی ناپاکی.
٢. کردنی تاوان بە هەلزانینی ئەو دەرفەتەی هەستنەکردنی تاوانلێکراو یان بێتوانایی لە بەرگریکردن یان لەو بارودۆخانەی کەس ناتوانێت بەرگریی لێ بکات.
٣. بەکارهێنانی ڕێگای وەحشیگەرییانە بۆ کردنی تاوان و سووکایەتیکردن بە تاوانلێکراو.

هێناویەتی، بۆ نموونە لە بڕگەی ٤ی هەمان ماددە ئەوەی کە پەیوەندیدارە بە خاسیەتی کەسێتیی تۆمەتبار دەڵێت، بە بارودۆخی قورسکردن دادەنرێت ئەگەر بێت و (تاوانبار لە تاوانکردن پایەکەی وەک فەرمانبەرێک بەکار بهێنێت یاخود خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتی یاخود ناوبانگ لە فەرمانبەرێتییەکەیدا).

ئەوەی پەیوەندیدارە بە بارودۆخی قورسکردنی سزا بە هۆکاری کەسێتیی تایبەتی بکەر لە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەدا، یاسادانەری عێراقی لە هەر دوو ماددەی ٤١٧ بڕگەی ٣ و ماددە ٤١٨ بڕگەی ٣ی یاسای سزاداندا، باسی لە حاڵەتی توندکردنی سزای بە هۆکاری کەسێتیی تایبەتی تۆمەتبارەوە لە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە کردووە. لە بڕگەی ٣ی ماددە ٤١٧ دا هاتووە کە ئەگەر بێت و بکەر پزیشک یان مامان یان دەرمانساز یان تاقیگەیی یان یەکێک لە هاوکارەکانیان بێت، ئەوا ئەمە دەبێتە یەکێک لەو بارودۆخانەی سزای تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەی پێ قورس دەکرێت. لەم ماددەیەدا لە حاڵەتی بوونی ڕەزامەندیی خانمەکە، ئەگەر کەسێک کۆرپەلەکەی لەبار ببات، لە حاڵێکدا بکەر خاوەندارێتیی کەسایەتییەکی تایبەت، وەک ئەوەی لە سەرەوە ئاماژەی پێ کراوە، بکات ئەوا ئەمە دەبێتە یەکێک لەو بارودۆخانەی قورسکردنی سزای بەدوادا دێت و دادوەر وەک ئەوەی لە ماددە ٤١٧ بڕگەی ٣ دا هاتووە، ناچار دەبێت سزای بکەر توندتر بکات. هۆکارو فاکتەر زۆرن لەم بارەوە، سەرەڕای ئەو بارودۆخانەی لە ماددە ١٣٥ی

---

٤. تاوانبار لە تاوانکردن پایەکەی وەک فەرمانبەرێک بەکار بهێنێت یاخود خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتی یاخود ناوبانگەکەی لە فەرمانڕەوایەتیەکەیدا.

یاساکەدا هاتوون، کە وایان کردووە بە بڕگەیەکی تایبەت و لە ماددەی تایبەتی ئەم تاوانە، یاسادانەر، بارودۆخی قورسکردکرنی سزا، بۆ ئەم تاوانە بڕیار بدات، گرنگترینیان بریتین لەوەی ئەو جۆرە کەسانە وەزیفەی فەرمی یان پیشەییان بقۆزنەوە، ئەمەش بەپێی یاسای سزادان و زۆرێک لە یاساو ڕێنمایی تر ڕێگەپێدراو نییە. پاشان ڕێکاری ئەنجامدانی ئەم تاوانە لەلایەن ئەم جۆرە کەسانەوە بە هۆی پیشەکەیان ئاسانترو سووکترە، چونکە ئامرازەکانی ئەنجامدانی ئەم تاوانە لەلای ئەوان ئاسانتر بەدەست دێت وەک لە کەسانی ئاسایی ناو کۆمەڵگە. جگە لەوەش دەتوانن بە شێوەیەکی ئاسانتر شوێنەواری تاوانەکانیان بشارنەوە، بەو هۆیەوە ئەندازەو ئاماری ئەنجامدانی ئەم تاوانە لە کۆمەڵگەدا زیاترو گەورەتر دەبێت، بۆ نموونە پزیشکێک سروشتی پیشەکەی پابەندی دەکات بەوەی پارێزگاری لە ژیانی خەڵک و جەستەو تەندروستییان بکات، بەڵام بۆ ئەوەی بە پێچەوانەی ئەو پەیام و پیشە پیرۆزەی نەجووڵێتەوەو نەیکاتە دەرفەتێک لە ڕێیەوە دەستدرێژی بکاتە سەر مافگەلێک کە یاسا پارێزگارییان لێ دەکات و، لەبەر چەندین هۆکاری دیکەیش، یاسادانەر بڕیاری قورسکردنی سزای بۆ ئەو چینە لە کۆمەڵگە دیار کردووە.

ئەوەی پەیوەندیدارە بە بڕگەی ٣ی ماددە ٤١٨ وە، بە هەمان شێوە یاسادانەری عێراقی لە بەر بوونی ئەو هۆکارانەی لە سەرەوە ئاماژەمان پێ دان، قورسکردنی سزای بۆ ئەو کەسانەی خاوەندارێتیی جۆرێک لە پیشەو کەسایەتیی فەرمی دەکەن، بڕیار داوە. ئەوەی گرنگ و جیاواز بێت لەوەی کە ئەم ماددەی ٤١٨ لەگەڵ ٤١٧ دا جیا بکاتەوە، لە ڕوانگەی بارودۆخی قورسکردنی سزاوە،

به هۆکاری کەسێتیی تایبەتی تۆمەتبار، ئەوەیە کە لە ماددە ٤١٨ دا بکەر بەبێ بوونی ڕەزامەندیی خانمە دووگیانەکە کرداری ماددی تاوانەکەی ئەنجام داوە، پاشان لەبەر ئەو دەرئەنجامەی لە کردارە ماددییەکەوە بەدی هاتووە، کە مردنی تاوان لەسەرکراوە واتە خانمە دووگیانەکە، یاسادانەر سەرەڕای قورسکردنی سزای زیندانیکردن بۆ پازدە ساڵ، بارودۆخی قورسکردنی سزایشی بۆ بکەر بڕیار داوە، لە حاڵێکدا ئەگەر بێت و پزیشک، دەرمانساز، مامان، تاقیگەیی، یان یەکێک لە هاوکارەکیان بێت. جگە لەوەش، دادگای پابەند کردووە لە دوای سەپاندنی سزای قورس بەسەر بکەردا ڕێگە لە بەئەنجامگەیاندنی پیشەکەی یان کارە فەرمییەکەی بگرێت بۆ ماوەیەک کە زیاتر نەبێت لە سێ ساڵ.

**بارودۆخی سووککردنەوە لە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەدا (الظروف المخففة في جريمة الاجهاض)**

یەکێک لە گرنگترین و گەشاوەترین بنەماکان، کە لە یاسای سزادانی وڵاتە جیاوازەکانی دنیادا قەبوڵکراوەو کاری لەسەر دەکرێت، بنەمای تاککردنی سزا (مبدأ تفريد العقوبة) یە. دادوەر کە سزا دەر دەکات پابەندە بە سوودوەرگرتن لە ئامرازی تایبەت کە یاسادانەر هەڵی بژاردوەو لە بژاردەی ئەودا بڕیاری لێ داوە، بە مەبەستی مسۆگەرکردنی زۆرترین ئامانجی سزا، بە لەبەرچاوگرتنی تایبەتمەندی خانەوادەیی، فەرهەنگی، کۆمەڵایەتی، ئابووری... هتد، تۆمەتبار، سزای گونجاوتر بە بارودۆخی ئەو، بڕیار بدات. سوودوەرگرتن لە بەشێک لەو ئامرازانە، وەک بارودۆخی قورسکردن و سووککردنەوەی سزاو ڕاگرتنی جێبەجێکردنی سزا (إيقاف تنفيذ العقوبة)، پەیوەندیدار بە کاتی دەرکردنی

حوکمەکەوەو کارکردن بە بەشێکی دیکە لەو ئامرازانە وەک ئازادکردنی مەرجدار (الإفراج الشرطي)، بە قۆناغ و هەنگاوی گرنگی دەستەبەرکردنی ئامانجی سزا دادەنرێت. بابەتی کەمکردنەوەی سزا یەکێکە لەو بابەتانەی چەندین شێوەی جۆراوجۆری بڕیوەو جێگیر بووە. ئەگەرچی لە گوزەشتەدا، بە بەڵگەی خراپ سوودوەرگرتنی دادوەران لە هەڵبژاردەی بێسنووردا کە لە دیارکردنی سزادا بەوان سپێررابوو، یاساناسی وەک سزار بکاریا، نەیاری سزاگەلێک بوون کە لە جۆرو شێوەی لایەنی زۆرو کەم بوون و بە مەبەستی ڕێگرتن لە سەرەڕۆیی بەشێک لە دادوەران، سیستمی سزای جێگیریان پێشنیاز دەکرد. بەڵام ئێستا، بە لەبەرچاوگرتنی ئەو پێشکەوتنانەی یاسای تاوانی و سزا بەخۆیەوە بینیوە، کەمتر یاساناسی وەها بەدیار دەکەوێت کە باوەڕی بە سزای جێگیر هەبێت. ئەمڕۆ، لە سیستمە جیاوازەکانی یاسادا سیستمی سزای لایەنی کەم و زۆر قەبوڵکراوەو دادوەر لە حاڵەتی بوونی پێویستی، هەتا دەتوانێت سزای کەمتری لە ڕێژەی لایەنی کەمی سزاوە کە یاسا بڕیاری لێ داوە بڕیاری لێ بدات، یان بە سزایەکی تری گونجاو بیگۆڕێت (لە پێگەی www.ghavanin.ir وەر گیراوە).

هۆکارە سووککەرەوەکانی سزا، هۆکارگەلێکن هەر کاتێک لەگەڵ بارودۆخی تاوانێکدا بێنەدی سزای تاوانکاری پێ کەم دەکات. کەمکردنەوەی سزا لەم سۆنگەیەوە کە لە یاسادا بڕیاریان لەسەر دراوە (هەرچەندە جاری وا هەیە ڕێژەکەی دیار نەکراوە) و دادوەر وەک ئەرکێکی یاسایی لەسەریەتی بە جێبەجێییان بکات، ئەمانەیش پاساوەکانی سووککردنەوە (یاساییەکان) یان پێ دەگوترێت. بەڵام دەگونجێت

سەپاندنی سزای سووککراوە لە دەسەڵاتی دادوەردا بێت، کە بە بارودۆخە دادوەرییە سووککەرەوەکان ناو دەبرێن (اردبیلی، سەرچاوەی پێشوو: ١٤٢).

لە یاسای سزاداندا پاساوەکانی سووککردنەوەی سزا کراونەتە دوو بەشەوە، کە بریتین لە پاساوە یاساییەکان و بارودۆخە دادوەرییە سووککەرەوەکان. لە خوارەوە ئاماژە بە هەریەکەیان بەجیا دەدەین:

١- پاساوە یاساییەکان (الأعذار القانونية)

پاساوە یاساییەکان، پاساوگەلێکن کە لە یاسادا بڕیاریان لێ دراوە. دەبنە هۆی بەخشین یان سووککردنی سزاو ئەم فاکتەرانە لە یاسادا بە شێوەیەکی دیارکراو ئاماژەیان پێ دراوە (یلماز ابراهیم محمد، لە ڕێگەی همداد محمد صابر، سەرچاوەی پێشوو: ٣٦). ئەم هۆکارانە پاساوی یاساییان پێ دەوترێت، چونکە بە یاسا دیار کراون و دادوەر لە قۆناغی دادگاییکردندا بەتایبەتی لە قۆناغی دەرکردنی بڕیاردا، لە حاڵەتی بوونی یەکێک یان زیاتر لەو پاساوە یاساییانە پابەندە پێیانەوە، پێویستە لەسەری لە ژێر ڕۆشنایی ئەو پاساوە یاساییانە بڕیاری پێویست و گونجاو دەر بکات و ناتوانێت خۆی لێیان بێئاگا بکات.

لەژێر ڕۆشنایی ئەوەی ئاماژەی پێ درا، پاساوە یاساییەکان دەکرێت بۆ دوو جۆر دابەش بکرێن، ئەوانیش پاساوە یاساییە گشتیەکان و پاساوە یاساییە تایبەتییەکانن.

پاساوە یاساییە گشتییەکان تایبەت نەکراون بە تاوانێکی تایبەتەوە، بەڵکو لە حاڵەتی هاتنەدییان دەکرێت بۆ تەواوی تاوانەکان سوودیان لێ وەر بگیرێت. لە

مادده ١٢٨[1]ی یاسای سزاداندا یاسادانەر بە ڕوونی باسی لەم حاڵەتە کردووە بە پێچەوانەوە فاکتەرە یاساییە تایبەتەکان لە یاسای سزاداندا بە بوونی ماددەیەکی دیارکراو تایبەتکراون بە تاوانێکی دیار کراوەوە. وەک ئەوەی یاسادانەری عێراقی لە مادده ٣١١ی یاسای سزاداندا هێناویەتی. ئەم پاساوە یاساییانە دەکرێت هەم ببنە هۆی ئەوەی تۆمەتباری تاوانێک بە تەواوی لە سزای یاسایی ڕزگاری ببێت، دەشکرێت ببنە هۆی سووککردنەوەی سزای بڕیارلێدراو لە یاسادا تایبەت بە تاوانێک. لەم حاڵەتەدا لەیەکچوونێک بەدی دەکرێت لە نێوان ئەم جۆرە لە سووککردنی سزا لەگەڵ بارودۆخە دادوەرییە سووککەرەوەکان.

٢- بارودۆخە دادوەرییە سووککەرەوەکان (الظروف القضائية المخففة)

بارودۆخە دادوەرییە سووککەرەوەکان کۆمەڵێک حاڵەت و بارودۆخن وەک فاکتەرە یاساییەکان دەبنە هۆی هێنانەخوارەوەی ڕێژەی سزا، لەم ڕووەوە لەوەی پێشوویان جیا دەکرێنەوە کە هەر کاتێک بۆ دادوەر

---

[1] **مادده ١٢٨:**

١. پاساو یان ئەوەتا لێبوردنە لەو سزایە یاخود بۆی سووک کراوەو پاساو نابێت تەنیا لەو حاڵەتانە نەبێت کە یاسا دیاری دەکات. جگە لەو حاڵەتانە نەبێت بە پاساوی سووککەرەوە دادەنرێت کردنی تاوانێک بە هۆی نیازپاکی یاخود لە سەر سووکایەتی پێکردنێکی مەترسیدار بێت لەلایەن تاوانلێکراو بە ناهەقی.
٢. پێویستە لەسەر دادگا لە هۆیەکانی دادگاییکردنەکەی پاساوی لێبوردنی لەو سزایە ڕوون بکاتەوە.

ئاشكرا بوون و هاتنەدی، ئەوا پێدانی بڕیاری سووككردنی سزا لە دەسەڵاتی دادوەردا دەبێت و دادوەر دەستی ئاوەڵایەو دەتوانێت بڕیاری سووككردنەكە بدات و دەشتوانێت ئەو بڕیارە نەدات. گرنگترین سوودێك كە بۆ بارودۆخە دادوەرییە سووككەرەوەكان بێتە ئەژمار ئەمانەیە:

**یەكەم:** جێبەجێكردنی سزاكە كە لەگەڵ كەسێتیی تاوانباردا بگونجێت.

**دووەم:** هێنانەدیی دادگەریی لە ژێر چاودێریی بیری گشتیدا.

بارودۆخە سووككەرەوەكان ڕێگە بە دادوەر دەدەن لە ژێر ڕۆشنایی ئیرادەو پێشینەو هەروەها ئەنگیزەی تاوانكار لە ئەنجامدانی تاوانەكەیدا، بڕیارەكەی بە باشترین شێوە لەگەڵ بارودۆخی ئەودا بگونجێنێت. بنەمای تاككردن سزا، بەتایبەتی لەو ماددانەی سزای جێگیریان تێدایە وەك سزای لەسێدارەدان، دیاركردنی ئاستی سزایەكی گونجاو دژوار دەكات، بۆیە پێویست دەكات دادوەر لەم جۆرە دۆخانەدا ئامرازگەلێكی لەبەردەستدا بن تا بەو مەبەستە بگات. ئەم ئامرازانەیش هەمان بارودۆخە دادوەرییە سووككەرەوەكانن (اردبیلی، سەرچاوەی پێشوو: ١٤٤-١٤٥).

دەتوانین بڵێین بارودۆخە دادوەرییە سووككەرەكان چەند تایبەتمەندییەكی بابەتی یان كەسین، كە ڕێگە دەدەن بۆ كەمكردنەوەی سزای تاوانێك بەپێی ئەو پێوەرەی كە یاسا بڕیاری لێ داوە (علي حسين الخلف وسلطان عبد القادر الشاوي، سەرچاوەی پێشوو: ٤٥٧).

لەبەر ئەوە، بەپێچەوانەی پاساوە یاساییەكان، دادوەر بەپێی یاسا پابەند نییە ئەو بارودۆخانەی دەبنە هۆی سووككردنەوەی سزا جێبەجێ بكات، بەڵكو دەسەڵاتێكی

کراوەی هەیە نەک ئەوەی پابند بکرێت، وەک ئەوەی لە پاساوە یاساییەکاندا هەیە. هەروەها تەواوی پاساوە یاساییەکان بە شێوەیەکی دیارکراو لە یاسادا هاتوون و بڕیاریان لێ دراوە، لە کاتێکدا بارودۆخە دادوەرییە سووککەرەوەکان لە یاسادا ڕوون نەکراونەتەوەو دادگا بڕیاریان لێ دەدات.

بە سەرنجدان لە مادده یاساییەکانی یاسای سزادان دەر دەکەوێت یاسادانەری عێراقی باس لەم بارودۆخانە، کە دەبنە هۆی سووککردنەوەی سزای تاوانبار، دەکات. بۆ نموونە لە مادده ١٣٢ دا هێناویەتی کە ئەگەر بۆ دادگا دەر بکەوێت لە تاوانێکدا بارودۆخی تاوانبار یان تاوانەکە پێویستی بە جۆرێک لە میهرەبانی هەیە، بۆ دادگا هەیە بڕیاری سووککردنەوەی سزا دەر بکات.

ئەوەی پەیوەندیدارە بە بەرجەستەبوون و هاتنەدیی بارودۆخی دادوەریی سووککەرەوە لە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەدا، دادگا ماددەی ١٣٢ی یاسای سزادانی تایبەت بە بارودۆخەکانی سووککردنەوە پیادە دەکات و یاسادانەر بە ڕوونی لە سیاقی بڕگەی ٤ی مادده ٤١٧ی یاسای سزادانی عێراقیدا، باسی لێ کردووە، کە ئەگەر بێت و خانمێک بە شێوەیەکی ناشەرعی (واتە لە دەرەوەی پەیوەندیی ژن و مێردایەتی) دووگیان بووبێت و ئەگەر کۆرپەلەکەی لەبار ببات، لەم بارەدا بە بارودۆخی سووککردنەوەی دادوەری دادەنرێت، ئەویش بە فاکتەری ئەوەی کە خۆی لە مەترسیی ئابڕووچوون قوتار دەکات. بە هەمان ڕەنگ ئەم بارودۆخە دەتوانرێت سوودی لێ وەر بگیرێت بۆ ئەو کەسانەی بە ئەنجامدانی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە هەڵ دەستن، ئەگەر بێت و لە خزمانی خانمە دووگیانەکە بن تا پلە دووی خزمایەتی -

کە دایک، باوک، برا، خوشک، کوڕ، کچ، باپیر، داپیر، کوڕی کوڕ، کچی کوڕو مێرد دەگرێتەوە.

بێگومان گرنگترین هۆکاری دیارکردنی خزمانی خانمە دووگیانەکە تا پلە دوو کە سووککردنی سزا بیانگرێتەوە لەم تاوانەدا، زیاتر بۆ ئەو بارودۆخە کۆمەڵایەتییە دەگەڕێتەوە کە کۆمەڵگەی عێراقی بە کوردستانیشەوە تێیدا دەژیت، بەوەی پەیکەری خێزان بابەتێکی زۆر پیرۆزو پتەوی ئەم کۆمەڵگەیەیەو هەر جۆرە لەکەدارکردن و شێواندێک، بە هەر جۆرێک بێت، ڕووبەڕووی ئەم پەیکەرە خێزانییە ببێتەوە، وەک ئەوە وایە بەرانبەر تەواوی خێزانەکە ئەنجام درابێت، بەتایبەتی لەم تاوانەدا، ئەگەر بێت و خانمێک بە شێوەیەکی ناشەرعی لە کەسێک دووگیان بووبێت، ئەمەیش پەیوەندیدارە بە حاڵەتی ئابڕووو ئەخلاقی کۆمەڵایەتی خێزانەکەو کۆمەڵگەشەوە، لەبەر ئەوە تا ئێستاش قەبوڵکراو نییەو بە هێڵی سوور دا دەنرێت.

## پاراستنی مافەکانی کۆرپەلە لە دووتوێی پەیماننامەو ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکاندا

بە سەرنجدان لە تەواوی ئەو پەیماننامەو ڕێککەوتننامە نێودەڵەتییانەی لە جیهاندا هەن، دەر دەکەوێت هیچ پەیماننامەو ڕێککەوتننامەیەک بگرە جاڕنامەیەکی نێودەڵەتی نییە کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆو تایبەت و لە ژێر ناونیشانی هیچ ماددەو بڕگەیەکی یاساییدا باسی لە پاراستن و چاودێریکردنی کۆرپەلەی کردبێت. بەڵکو ئەوانەی هەن زیاتر فۆکسیان خسووەتە سەر پاراستن و چاودێریکردنی مافەکان مرۆڤ لە پاش قۆناغی لەدایکبوون. بێگومان هەر یەکێک لەو پەیماننامەو ڕێککەوتنامانەش بە شێوەی جیاواز

گرنگی به لایەن و چینێکی تایبەتی کۆمەڵگە دەدەن، بەڵام بە وردبوونەوە لە بەشێکیان، ڕوون دەبێتەوە لە چوارچێوەی ماددە تایبەتەکانیاندا چەند بڕگەیەک هەن کە دەکرێت بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بۆ پاراستن و چاودێریکردنی کۆرپەلە پشتیان پێ ببەسترێت، تا بە هۆیانەوە پاڵشتییەکی یاسایی و نێودەوڵەتی بەهێز دروست ببێت کە ڕێگری لە هەر جۆرە دەستدرێژی و کردارێکی تاوانکاری بکات کە بکرێتە سەر خانمانی دووگیان، بە ئامانجی مانەوەو لەبارنەبردنی کۆرپەلەکانیان.

لە خوارەوە ئاماژە بە بەشێک لەو پەیماننامەو ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییانە دەدەین کە بە شێوەی ناڕاستەوخۆ لە چەند ماددەو بڕگەیەکدا گرنگی و پابەندبوونێکی تایبەتیان داناوە، کە دەکرێت بۆ پاراستن و مانەوەی کۆرپەلە بە شێوەیەکی تەندروست سوودیان لێ وەر بگیرێت:

**ڕێککەوتننامەی مافەکانی منداڵ**

ڕێککەوتننامەی مافەکانی منداڵ لەلایەن کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بە بڕیاری ٤٤ لە ٢٥ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٩ بڕیاری لێ دراوەو بەپێی ماددە ٤٩ی ڕێککەوتننامەکە دوای تێپەڕبوونی سی ڕۆژ لە بەرواری ٢ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٩٠ کەوتووەتە بواری جێبەجێکردنەوەوە.

بە سەرنجدان لە ناوەڕۆکی ئەم ڕێککەوتننامەیە ئاشکرا دەبێت کە بە شێوەیەک لە شێوەکان بۆ دابینکردنی چاودێرییەکی تایبەت بۆ منداڵ، هاتووە لە ژێر کاریگەری و ڕۆشنایی دوو جاڕنامەی گرنگی پێش خۆی ماددەو بڕگەکانی لە سنوورێکی فراوانتردا

داڕشتووە. ئەو دوو جاڕنامە نێودەوڵەتییە گرنگانەش بریتین لە جاڕنامەی جنێڤ بۆ مافەکانی منداڵانی ساڵی ١٩٢٤ و جاڕنامەی مافەکانی منداڵان کە لەلایەن کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە لە ٢٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٩ لەخۆ گیراوە.

ڕێککەوتننامەی مافەکانی منداڵ لە ٥٤ ماددە پێک هاتووە، لە ماددەی یەکەمیدا پێناسەی منداڵی کردووەو دەڵێت: منداڵ هەر مرۆڤێکە تەمەنی ١٨ ساڵی تەواو نەکردبێت و نەگەیشتبێتە تەمەنی پێگەیشتن و، ئەو یاسایەی بەسەریدا جێبەجێ دەبێت.

زۆرێک لە جاڕنامەو ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکان بە بەکارهێنانی کۆمەڵێک دەستەواژە لە ناو ماددەو بڕگە یاساییەکانیاندا، کە چەمک و واتایەکی گشتی و فراوان دەگەیەنن، هەنگاویان ناوە، دواجاریش بەبێ ئەوەی پاشکۆیەکی پێویست بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو دەستەواژە گشتییانە گەڵاڵە بکەن، بڕیاری کۆتایی بۆ دەرکردنیان دراوە. لەبەر ئەوە لەم ڕێککەوتننامەیەو لە ماددەی یەکەمیدا نەهاتووە ڕوونی بکاتەوە کە قۆناغی دەستپێکردنی تەمەنی منداڵی لە چ کاتێکەوە دەست پێ دەکات، ئایا لە قۆناغی دوای لەدایکبوونیەوەیەتی تا تەمەنی ١٨ ساڵی یان لە قۆناغی یەکەمی پیتاندنی هێلکەی ئافرەت بە تۆوی پیاوەوەیە – واتە خاڵی دەستپێکردنی حاڵەتی دووگیانبوونی خانمێک؟ بەڵام ناوەڕۆکی زۆربەی ماددەکانی ئەم ڕێککەوتننامەیە ئاماژەیە بۆ پابەندبوون بە پاراستنی کۆمەڵێک مافەوە کە هەر منداڵێکی ئاسایی لە دوای لەدایکبوونیەوە پێویستە هەیانبێت.

بە هەمان شێوە چەند ماددەیەکی دیکە بەرچاو دەکەون کە دەکرێت وەک پاڵپشت و پابەندبوونێکی

بەهێز لەبەرچاو بگیرێن کە ئاماژەن بە پاراستن و چاودێریکردن و بە تەندروست مانەوەی کۆرپەلە. بۆ نموونە، لە بەشی یەکەمی ڕێککەوتننامەکەو لە بڕگەی (ب)ی خاڵی ٤ی مادده ٢٤ دا دەڵێت: دەبێت دەوڵەتانی ئەندام چاودێرییەکی گونجاو بۆ دایکان پێش لەدایکبوون و پاش لەدایکبوونی منداڵەکەی مسۆگەر بکەن. هەروەها لە خاڵی ٦ی هەمان ماددەی سەرەوەدا دەڵێت: پێویستە پەرەپێدانی چاودێری تەندروستی خۆپاراستن و ئەو ڕێنماییانەی پێشکەش دەکرێن بە دایک و باوک، فێرکردن و گەشەپێدانی ئەو خزمەتگوزارییانەی پەیوەندییان بە ڕێکخستنی خێزانەوە هەیە مسۆگەر بکرێن. ئەمانەو لە چەندین ماددەی دیکەی ڕێککەوتننامەکەدا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆو پچڕپچڕ پاراستن و چاودێریی تایبەتی بۆ دایکان پێش لەدایکبوونیان خستووەتە ئەستۆی وڵاتانی ئەندام.

## پەیماننامەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە مافە ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکان

پەیماننامەی نێودەوڵەتیی تایبەت بە مافە ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکان بەپێی بڕیاری ٢٢٠٠د/٢١، لە ١٦ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٦٦ی کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان پشتی پێ بەستراوەو خراوەتە ڕوو بۆ ئیمزاکردن و متمانەوەرگرتن و لە ٣١ مادده پێک هاتووە.

دەوڵەتانی ئەندام یان لایەنەکانی ئەم پەیماننامەیە وای دەبینن بەپێی ئەو پرەنسیپانەی لە پەیماننامەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتووە دانانان بە شکۆمەندیی ڕەسەن و یەکسان و نەگۆڕی مافەکانی هەموو ئەندامانی خێزانی مرۆڤایەتی بناغەی ئازادی و دادو ئاشتییە لە جیهاندا،

لەبەر ئەوە بڕیار دەدەن لەسەر ئەوەی ئەو مافانە لە ڕێزی مرۆڤی ڕەسەنەوە دێن کە تێیدان.

بە هەمان شێوە ئەم پەیماننامەیە، لە ژێر کاریگەری و سەرچاوەی زۆرێک لە پەیماننامەو ڕێککەوتننامە کە پێش خۆی و پاش خۆی چەسپێنراون لە چەند بڕگەو ماددەیەکی دیارکراودا پێداگیریی لەسەر پاراستن و بە تەندروست هێشتنەوەی کۆرپەلە لە پێش لەدایکبوونیدا کردووەتەوە، بە مەبەستی پاراستن و لەبارنەبردنی.

لێرەدا ئاماژە بە بڕگەی ٢ی ماددە ١٠ی ئەم پەیماننامەیە دەدەین کە دەڵێت: پێویستە پاراستنێکی تایبەت بۆ دایکان دابین بکرێت بۆ ماوەیەکی لۆجیکی پێش منداڵبوون و پاش منداڵبوونیش و دەبێت دایکانی کرێکار لە ماوەی ئاماژە بۆکراو مۆڵەتی بە مووچەیان پێ بدرێت، یان مۆڵەتێک بێت بیمەی کۆمەڵایەتیی گونجاوی لەگەڵدا بێت.

بێگومان لە زۆرێک لە ماددەکانی دیکەی ئەم پەیماننامەیە، ئاماژە بۆ پاراستن و چاودێریکردنی پەیکەری خێزان بە شێوەیەکی گشتی، پاشان بە چین و توێژە ئاماژەپێکراوە جیاوازەکانی ناو پەیماننامەیە دەکات.

**پەیماننامەی نەهێشتنی هەموو جۆرە جیاکارییەك لە دژی ژنان**

لە ١٨ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٩دا هەنگاوێکی گرنگ و سەرەکی بەرەو بەدیهێنانی ئامانجی پێدانی مافی یەکسانی بە ژنان نرا، ئەمەش کاتێک کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕێککەوتننامەی نەهێشتنی جیاوازیی بە هەموو شێوازەکانی دژی ژنانی پەسەند کرد، کە لە ٣٠ ماددە پێک هاتووەو خراوەتە فۆرمێکی

یاساییەوە بە مەبەستی پابەندبوون بەو ڕێوشوێنانەی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی پەسەند کراون لەپێناو بەدیهێنانی یەکسانی لە مافەکاندا بۆ ژنان لە هەموو شوێنێکی جیهان.

ئەوەی پەیوەندیدارە بە پاراستن و مانەوەی ژیانی کۆرپەلە لە دەقەکانی ئەم پەیماننامەیەدا، بە شێوەی پچڕپچڕو جیاواز لە چەند ماددەو بڕگەیەکیدا، جەختی لەسەر گرنگیی چاودێریکردن و هێشتنەوەی تەندروستیی خانمان لە قۆناغە جیاوازەکانی ژیانیدا کردووەتەوە. بۆ نموونە لە قۆناغی دووگیانیدا، لە بەشی ٣ی ئەم پەیماننامەیەدا لە خاڵی یەکەمی بڕگەی (و)ی ماددە ١١ دا هاتووە دەڵێت: دەوڵەتانی لایەن هەموو ئەو ڕێوشوێنانەی پێویست بێت بە مافی پارێزگاری تەندروستی و سەلامەتیی خانمان لە شوێنی کار بگرنە بەر، لەگەڵ ئەوەشدا پابەندبن بە پاراستن و پارێزگاری لێکردنیان لە کاتی دووگیانبوونیاندا.

بە هەمان ڕەنگ لە خاڵی دووەم و لە بڕگەکانی أ، ب و د دا هاتووە. لە خاڵی أ دا دەڵێت: بۆ ڕێگریکردن لە دوورخستنەوەی خانمان لە کارکردن بە هۆی دووگیانی یان مۆڵەتی دایکایەتی و جیاکاری لە دوورخستنەوەی لە کارکردن لەسەر بنەمای باری خێزانی، سزا بەسەر سەرپێچیکاراندا دەسەپێنرێت.

لە خاڵی ب یشدا دەڵێت: دانانی سیستمی مۆڵەتی دایکایەتی بە مووچەوە، یاخود هەبوونی ڕووە کۆمەڵایەتیە هاوبەشەکانی دیکە بەبێ ئەوەی ژنی فەرمانبەر کارەکەی لەدەست بدات یان بەرزبوونەوە کۆمەڵایەتییەکانی بۆ هەژمار نەکرێت.

هەرچی لە خاڵی **د** یشدایە دەڵێت: دابینکردنی پاراستنێکی تایبەت بۆ خانمان لە کارکردن لە کاتی

دووگیانیدا، ئەگەر سەلمێنرا کارەکەیان زیانیان پێ دەگەیەنێت.

لە خاڵی دووەمی ماددە ١٢ی ئەم پەیماننامەیەدا دەڵێت: لەگەڵ بوونی ڕێساکانی بڕگە ١ی ئەم ماددەیە دەوڵەتانی لایەن پابەند دەبن بە دابینکردنی خزمەتگوزاریی گونجاو کە لە کاتی دووگیانی و منداڵبووندا پێویستن، لە کاتی پێویستیشدا هەموو خزمەتگوزارییەکی بێبەرانبەری پێشکەش دەکرێت، هەروەها خواردنی تەواو لە کاتی دووگیانی و شیردان بە منداڵ.

هەموو ئەو ماددەو بڕگە یاساییانەی لەو ڕێککەوتننامەو پەیماننامە نێودەوڵەتییانەی سەرەوە ئاماژەمان پێدان جەخت لەسەر پاراستن و چاودێریکردنی کۆرپەلەو خانمانی دووگیان دەکەنەوە لە هەر جۆرە هەڕەشەو مەترسییەکی تەندروستی، کە ببێتە هۆی زیانگەیاندن چ بە کۆرپەلەیەک کە هێشتا لە منداڵدانی دایکیدا بێت یان لە خانمێک کە بە هۆی حاڵەتی دووگیانبوونیەوە مەترسی لەسەر ژیان و تەندروستیی جەستەیی و دەروونیی دروست ببێت.

# دەرئەنجام

بەسەرنجدان لەوەی لە وێستگەی شیکردنەوەو باسکردنی چەمک و تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە، کە لە دووتوێی ئەم کتێبەدا خراونەتە ڕوو، لەباربردنی کۆرپەلە یەکێکە لەو تاوانانەی لە ژینگەیەکی پەنهاندا، بەڵام بە ڕەنگێکی بەرفراوان و لە پانتاییەکی گەورەی ئەم جیهانەدا لە نێوان نەژادو کۆمەڵگە جیاوازەکاندا بە ئەنگیزەی جۆراوجۆر ئەنجام دەدرێت.

ئەگەرچی بە دەرکەوتنی تیۆریی جۆراوجۆر، لە نێویشیاندا تیۆریی ڕێگریکردنی ڕەها، لەباربردن بە شێوەیەکی گشتی لە سەرەتادا ڕێگری لە ئەنجامدانی کرا، بەڵام لە ئەنجامی نەشونماو پێشکەوتنی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و فراوانبوونی ئاستی ئازادیی تاکەکان و کەمڕەنگبوونی بەها ئەخلاقیەکان، کەم کەم کۆمەڵگەکان خۆیانیان لێ لاداو ڕێژەی ئەنجامدانی بە شێوەیەکی بەرچاو بەتایبەت لە وڵاتانی خۆرئاوا زیادی کرد. وڵاتانی ئاسیاو ئەفریقایش و ئەوانەی زیاتر کاریگەرن بە بنەماکانی شەریعەتی ئیسلامی، بە هەمان چەشن بە بوونی چەند مەرج و تایبەتمەندییەک، ڕێگەیان بە لەباربردنی کۆرپەلە داوە.

بە شێوەیەکی گشتی ئەوەی پەیوەندیدار بێت بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەوەو ئەوەی لە وێستگەکانی نووسینی ئەم کتێبەدا پێی گەیشتووین ئەوەیە کە ئەم کتێبەمان دابەش کردووە بۆ سێ بەشی سەرەکی، لە بەشی یەکەمیاندا خوێندنەوەیەکی گشتگیرمان بۆ دەستەواژەی لەباربردنی کۆرپەلە کردووە، کە خۆی لە

شیکردنەوەو گەنگەشەکردنی چەمکی لەباربردنی کۆرپەلە لە ڕوانگەی پێناسەکردنیەوە لە ڕووی زمانەوانی و زاراوەی فیقیهی و پزیشکی و یاساییەوە دەبینێتەوە. وتمان کە هەر توێژەو لە ڕوانگەی ئەو تایبەتمەندی و تێگەیشتنە جیاوازەی هەیەتی پێناسەو ناساندنێکی تایبەتی بۆ چەمکی لەباربردن کردووە. ئەوەی ئاماژەپێدانی گرنگە ئەوەیە کە پێناسەکردنی لە ڕوانگەی یاساییەوە لە یاسای سزادانی عێراقیدا نەهاتووە، بەڵکو یاسادانەر ئەم ئەرکەی بۆ فیقە و دادگاو دامودەزگا دادوەرییەکان بەجێ هێشتووە. بەڵام بە شێوەیەکی گشتی، پێناسەی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە بریتییە لە: هاتنەدەرەوەی کۆرپەلە پێش کاتی سروشتیی لەدایکبوونی بە شێوەی خۆبەخۆ یاخود بە هۆی فاکتەرێک یان کرداری کەسێکەوە، بە بوونی زانیاری لەسەر بوونی کۆرپەلەیەک یان زیاتر، لە منداڵدانی خانمێکدا، بە مەبەستی لەباربردنی بەبێ بوونی هیچ ڕێگەپێدانێکی یاسایی. هەروەها جۆرەکان و جیاوازیکردنی لەگەڵ ناونیشانە لەیەکچووەکانیدا یەکێکی دیکەن لەو تەوەرە گرنگانەی لە سیاقی بەشی یەکەمدا هاتوون. ئاماژەمان بەوەدا کە لەباربردنی کۆرپەلە لە نێو زانستی یاسادا دەکرێت بۆ چەند شێوەیەک دابەش بکرێت، وەک لەباربردنی تاوانی یان ئەنقەست یان نائەنقەست... هتد، ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە لە یاسای سزادانی عێراقیدا ئەوەی پەیوەندیدار بێت بە لەباربردنی ئەنقەست و نائەنقەستەوە، تەنیا یەک شێوەی لەباربردنی کۆرپەلە ئاماژەی پێ کراوە کە ئەویش لەباربردنی ئەنقەستەو شێوە نائەنقەستەکەی نەهاتووە کە بە یەکێک لەو ڕەخنە زەقانە دەستنیشان کرا کە پێویستی بە زیادکردن و هێنانی شێوە نائەنقەستەکەشی دەکرد. بە

هەمان ڕەنگ، هیچ ماددەیەکی تایبەت سەبارەت بە لەباربردن بە دەرمان یان لەباربردنی پزیشکییەوە نەهێناوە ئەویش لە حاڵەتی بوونی مەترسییەک بۆ سەر گیان و تەندروستیی خانمە دووگیانەکە بە بوونی مەرجی تایبەت ڕێگە بە لەباربردنی کۆرپەلە دەدرێت، پێویست بوو لەم بارەشەوە لە ناوەڕۆکی ماددەکانی تایبەت بەم تاوانە ئاماژەی پێ بکرێت.

هەروەها لە ناوەرۆکی بەشی یەکەمدا ئاماژەی پێویستمان سەبارەت بە لەباربردنی کۆرپەلە لە ڕووی پێشینەو مەبناو جیاوازیکردنی لەگەڵ ناونیشانە لەیەکچووەکانیدا کردووەو سێ تیۆریی گرنگمان لەم بارەیەوەدا خستووەتە ڕوو. لە کۆتایی ئەم بەشەشدا ئاماژەیەکی کورت و پوختمان سەبارەت بە لەباربردنی کۆرپەلە لە شەریعەتی ئیسلامیدا کردووە. وتمان پێشینەی یاسایی ئەم دیاردە کۆمەڵایەتییە لە یاسای سزاداندا، هەر لە یاسای سزادانی بەغدادی ساڵی ١٩١٨ ەوە تا قۆناغی دووەمی هەموارکردنی ئەم یاسایە لە ساڵی ١٩٦٩ دا بە تاوان ئەژمار کراوەو سزای تایبەتی بۆ دیار کراوە. بە هەمان شێوە لە ئاین و شارستانێتییە کۆنەکاندا بەرخوردکردن لە گەڵ ئەم دیاردەیەدا بابەتێکی تەواو ڕێگریلێکراو بووەو جێبەجێکارانی ڕووبەڕووی سزای جۆراوجۆر دەبوونەوە. بە هەمان شێوە سەبارەت بە مەبنای بەتاواندانانی ئەم دیاردە کۆمەڵایەتییە، تیشکمان خستە سەر ئەوەی مەبناو فاکتەری باوەڕپێکراو، ڕێخۆشکەر بوون کە لە فۆرمێکی ئاسایی و کردارێکی ڕێگەپێدراودا بەرخورد لەگەڵ ئەم تاوانەدا نەکرێت، چونکە لە چەندین ڕوانگەی جیاوازەوە ئەنجامدانی بە کارێکی نادروست و ناڕەوا ئەژمار دەکرێت.

سەبارەت بە جیاوازیکردنی لەگەڵ ناونیشانە لەیەکچووەکانیدا، پاڵپشت بە مەرج و ڕەگەزە سەرەکییەکانی ئەم تاوانە، ڕوونە کە تاوانێکی سەربەخۆیە، سەرەڕای بوونی هاودژی یان لەیەکچوون لەگەڵ تاوانەکانی دیکەدا.

ئەوەی پەیوەندیدارە بەو سێ تیۆرییە گرنگەی لە بەشی یەکەمدا تیشکمان خستنە سەر، وتمان لایەنگرو دانەرانی هەر تیۆرییەو بە جۆرێک لە جۆرەکان کۆمەڵێک فاکتەر پاساوی پێویستیان خستووەتە ڕوو تا ببنە بنەماو پاڵپشت بۆ بەرگریکرن لە بۆچوونەکانیان. باشترین و گونجاوترینیان، بە ڕای ئێمە، بریتییە لە تیۆریی سێیەم کە سنوورێکی هاوسەنگ و گونجاوی لە چاو دوو تیۆرییەکەی پێشوو بۆ خۆی داگیر کردووەو زۆربەی یاسادانەرانی وڵاتان و یاسادانەری عێراقیش پێی کاریگەر بوون و ڕەچاوی مەبناو ناوەڕۆکەکەیان کردووە.

لە کۆتا تەوەرەی بەشی یەکەمدا ئاماژەیەکی پوختمان سەبارەت بە لەباربردنی کۆرپەلە لە شەریعەتی ئیسلامیدا داوە. سەرەرای ڕاجیایی زانایانی شەریعەتی ئیسلامی لە هەندێک تەوەردا، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی کۆکن لەسەر ئەوەی لەباربردنی کۆرپەلە تاوانەو هەر کەسێک ئەنجامی بدات بەرپرسیارێتی ئاینیی لە ئەستۆ دەگرێت.

لە بەشی دووەمدا سەبارەت بە بنەماکانی تاوانی لەباربرنی منداڵ گفتوگۆی پێویستمان ئەنجام داوە. وتمان کە سەرەڕای بوونی مەرجی تایبەتی ڕوودانی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە کە بوونی کۆرپەلەکەیە، ئەم تاوانە لە سێ بنەمای سەرەکی پێک دێت، کە بریتین لە بنەمای یاسایی و ماددی و مەعنەوی.

لە کۆتا تەوەرەی بەشی دووەمدا ئاماژەیەکی پوختمان سەبارەت بە حوکمەکانی دەستپێکردن (شروع) و بەشداریی تاوانکاری لە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە دا. ڕوونمان کردەوە کە بۆ ئەوەی کردارێک بە تاوان ئەژمار بکرێت پێویستە سێ بنەمای یاسایی گرنگی تێدا بێتە دی، **یەکەمینیان** ئەوەیە کە دەبێت بەپێی بڕگەیەکی یاسایی لە یاسای تاوانی لە لایەن یاسادانەرەوە بە تاوان ئەژمار کرابێت. ڕوونە کە کرداری لەباربردنی کۆرپەلەیش لە سیاقی ماددەکانی ٤١٧، ٤١٨ و٤١٩ دەقی یاسای سزادندا یاسادانەری عێراقی بە تاوانی ئەژمار کردووە. **دووەمین** بنەما یان ڕەگەزی سەرەکیی تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە بریتییە لە بنەمای ماددیی تاوان. ڕوونە کە توخمی ماددی تاوان بە کورتی بریتییە لە ئەنجامدانی کردارێک کە یاسا ڕێگریی لێ کردووە یان ئەنجامنەدانی کردارێک کە یاسا فەرمانی پێ کردووە. لە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەدا بە سەرنجدان لە ماددە تایبەتەکانی لە یاسای سزادانی عێراقیدا، دەکرێت بە کردارێکی ئیجابی یاخود سلبی ئەنجام بدرێت، ئاماژەشمان بەوەدا کە یاسادانەر جۆرو چۆنێتیی ئەو کردارەی دیار نەکردووە کە پێویستە لەلایەن بکەرەوە سوودی لێ ببینرێت بۆ ئەنجامدانی تاوانەکەی، دەکرێت بە ئامرازی هەمەچەشن وەک لێدان یان بەکارهێنانی دەرمان... هتد کۆرپەلەکەی پێ لەبار ببات. بە هەمان چەشن سەبارەت بە ڕەگەزی **سێیەم** و کۆتایی کە بریتییە لە بنەمای مەعنەوی یان دەروونیی تاوان. لە بەشی دووەمی ئەم کتێبەدا ئاماژەی تێروتەسەلمان لەم بارەیەوە دا، وتمان کە بۆ هاتنەدیی ئەم تاوانە پێویستی بە ویست لەلایەن بکەرەوە هەیە، چونکە لە یاسای سزادانی عێراقیدا تەنیا حاڵەتی ئەنقەستی ئەم تاوانە

ئاماژەی پێ دراوە. خۆ ئەگەر هات و تاوانەکە بە چەشنێکی نائەنقەست بێتە دی و لە ئەنجامی کردارێکەوە منداڵێک لەبار بچێت بە مەرجێک ویستی لەباربردنی لەگەڵدا نەبێت، ئەوا تاوانی لەباربردن جێبەجێ نابێت.

لە کۆتا تەوەری بەشی دووەمدا ئاماژەیەکی پوختمان سەبارەت بە حوکمەکانی دەستپێکردن و بەشداریی تاوانکاری لەم تاوانەدا خستە ڕوو، وتمان کە بەپێی ئەو مەرج و حاڵەتە تایبەتانەی پێویستن بێنە دی بۆ جێبەجێبوون و هاتنەدیی هەر دوو حوکمی دەستپێکردن و بەشداریی تاوانکاری، دەکرێت لە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلەیشدا وەک زۆرێک لە تاوانەکانی دیکە پێشبینیی هاتنەدیی ئەم حوکمانەی تێدا بکرێت.

لە بەشی سێیەم و کۆتایی ئەم کتێبەدا سەرنجی خوێنەرانمان ئاراستەکرد بۆ شێوەی ئەنجامدان و سزای تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە. ئەوەی پەیوەندیدارە بە شێوەکانی ئەنجامدانی لەباربردنی کۆرپەلە، ئاماژەمان بەوە دا کە ئەم تاوانەش وەک زۆربەی تاوانەکانی دیکە بە چەشنی جۆراوجۆر جێبەجێ دەبێت. ئەوەی پەیوەندیدارە بە یاسای سزادانی عێراقییەوە لە هێنانی ماددەی تایبەت بەم تاوانە، یاسادانەر چەند شێوەیەکی تایبەتی وەک شێوەی هاتنەدیی ئەم تاوانەی دیار کردووە، هەندێکی دیکەشی دیار نەکردووە. ئێمە پێنج جۆری سەرەکیی شێوەکانی لەباربردنمان خستووەتە ڕوو:

**یەکەمیان** لەباربردنی سەرپشکانەیە، کە مەبەست لێی لەباربردنی کۆرپەلەیەک یان زیاترە، لە حاڵێکدا کە ڕەزامەندیی خانمە دووگیانەکە بەرجەستە ببێت. ئیتر یان ئەوەتا خودی خانمە دووگیانەکە بە کرداری

لەباربردنەکە هەڵ دەستێت یان بە ڕەزامەندیی خۆی کەسێک یان کەسانێکی دیکە بەو کارە هەڵ دەستن.

**دووەمیان** لەباربردنی زۆرەملێ، لەباربردنێکە کە بە هۆیەوە کۆرپەلەیەک لەلایەن کەسێکەوە یان زیاتر لە کەسێک، لە بارێکدا کە ڕەزامەندیی خانمە دووگیانەکە لە گۆڕێ نەبێت ئەنجام دەدرێت.

**سێیەمیان** لەباربردنێکە کە بەهۆی ڕووداوەکانی هاتوچۆوە ڕووی دابێت. یاسادانەری عێراقی لە یاسای هاتوچۆوە بیگرە تا یاسای سزادانیش هیچ ماددەیەکی تایبەتی لەسەر ئەم جۆرە نەهێناوەتەوە، بەو هۆیەوە هەر کۆرپەلەیەک بە هۆکاری ڕووداوەکانی هاتوچۆوە لەدەست بچێت هیچ بەرپرسیارێتییەکی یاسایی لەسەر کەمتەرخەمان و بکەرانی ڕووداوەکە دروست نابێت، لەبەر ئەوە پێویستی بە چارەسەرکردن و زیادکردنی ماددەی تایبەت دەکات.

**چوارەمیان** لێدانێک کە لەباربردنی کۆرپەلەی لێ بکەوێتەوە، ئەم شێوەیەشیان لە سیاقی ماددە ٤١٩ی یاسای سزاداندا ئاماژەی پێویستی لەسەر دراوەو بە ناونیشانی شێوەیەکی تایبەت لە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە هێناویەتی.

**پێنجەم** جۆریشیان لەباربردن بە دەرمانە، ئەم چەشنەشیان لە ئەنجامی ئەو بارودۆخ و مەترسییە تەندروستییانەی بۆ سەر خانمە دووگیانەکە پەیدا دەبێت ئەنجام دەدرێت. یاسادانەری عێراقی هیچ ماددەیەکی تایبەت بە لەباربردن بە دەرمانی نەهێناوەتەوە، ناچار دەکرێت سوود لە ماددە ٦٣ی یاسای سزادان وەر بگیرێت.

بە شێوەیەکی گشتی بۆ هەر یەکێک لەو پێنج چەشنەی سەرەوە ڕێکارو چۆنێتیی ئەنجامدان جیاوازەو

بە چەشنێکی پێویست پێشتر بۆ هەر شێوەیەکیان وردەکاریی گرنگ و پێویستمان خستووەتە ڕوو.

لە تەوەرەیەکی دیکەی بەشی سێیەمدا ئاماژەمان بە سزای بڕیارلێدراو بۆ تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە داو ئەوەی پەیوەندیدار بوو بە حاڵەتەکانی قورسکردن و سووککردنەوەی سزای بڕیارلێدراو بۆ ئەم تاوانە. بە شێوەیەکی گشتی لەبارەی چۆنێتی و چەندێتیی سزای بڕیارلێدراو بۆ ئەم تاوانەو حاڵەتەکانی قورسکردن و سووککردنەوەی سزا لە یاسای سزادانی عێراقیدا، سزای پێبژاردن لەگەڵ سزای بەندکردن لە کەمتر لە ساڵێکەوە تا پانزدە ساڵ بۆ بکەران و بەرپرسانی ئەم تاوانە دیار کراوە. ئەمە سەرەڕای بەرجەستەبوونی حاڵەتی قورسکردنی سزا، دەکرێت ئاست و جۆری سزای بڕیارلێدراویش گۆڕانکاریی بەسەردا بهێنرێت، لەوانەش ئەوەیە کە لە حاڵێکدا کە بکەر یەکێک بێت لەوانەی پیشەیەکی فەرمیی هەبێت وەک دەرمانساز یان مامان، ئەمانە سەرەڕای سزای ئاماژەپێدراوی سەرەوە، دادگا لەسەریەتی بۆ ماوەک کە زیاتر نەبێت لە سێ ساڵ لە پەیڕەوکردنی کاری پیشەیی فەرمیی خۆیان دووریان بخاتەوە.

لە کۆتا تەوەرەی بەشی سێیەم و ناوەڕکی ئەم کتێبەشدا گەنگەشەی گرنگترین ئەو پاراستن و چاودێرییانەی پەیوەندیدارن بە مافەکانی کۆرپەلەوە لە سیاقی پەیاننامەو ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتییەکاندا بە هێنانەوەی کۆمەڵێک پەیماننامەو ڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتی، کرد. ئاماژەی پێویستمان دا بەوەی هیچ ڕێککەوتننامە یان پەیماننامەیەک و لە ناوەڕۆکی هیچ یەکێکیش لەوانەی ئێستا هەن، بگرە لە جاڕنامەکانیشدا، بە شێوەیەکی تایبەت و ڕاستەوخۆو بە هێنانی ماددەی

تایبەت، ئاماژە بە پاراستن و چاودێریکردنی کۆرپەلە پێش لەدایکبوونی نەکراوە، بەڵکو ئەوەی هەیە بە چەشنێکی ناڕاستەوخۆو لە نێو کۆمەڵێک بڕگەو ماددەی ئەو ڕێکەوتننامەو پەیماننامانەدا باس لە ڕەچاوکردنی بڕێک ڕێکار دەکات کە پێویستە ببنە گرەنتی تا بە هۆیانەوە کۆرپەلە بە شێوەیەکی تەندروست بمێنێتەوە.

لە کۆتا وێستگەدا گرنگە پەنجە بخەینە سەر گرنگترین ئەو پێشنیازانەی پێویستن تایبەت بەم تاوانە بخرێنە ڕوو. وەک ئەوەی لە سەرەتادا ئاماژەمان پێ دا، تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە یەکێکە لەو تاوانانەی لە بارودۆخێکی پەنهان و ژینگەیەکی شاراوەدا ئەنجام دەدرێت و زۆر جار ناتوانرێت لەلایەن دامودەزگا دادوەرییەکان و پۆلیسەوە بدۆزرێتەوەو ڕێکاری پێویست و یاسایی بەرانبەر ئەنجام بدرێت. ئەمە وایکردووە تا ئێستا ئامارێکی وردو تەواو لەم بارەوە چ لە ناوخۆی عێراق و چ لە ئاستی نێودەوڵەتیشدا بەردەست نەبێت. لەبەر ئەوە، بۆ هێنانەخوارەوەی ڕێژەی ئەنجامدانی ئەم تاوانەو گەیشتن بە ئامارێکی ڕاست و واقیعی لە ئێستادا، تەنیا یاسا تاوانکارییەکان، لە نێویشیاندا یاسای سزادان، بەس نین و ناتوانن بە تەواوی یان بە ڕێژەیەکی بەرچاو ئەنجامدانی کەم بکەنەوە ئەگەر چاکسازییەکی ڕیشەیی و پێویست و پەیوەندیدار بە یاسای سزادان و یاساکانی دیکە ئەنجام نەدرێت. جگە لەوەش، گرنگە هەنگاوی دیکە لەلایەن کۆمەڵگەوە بە تەواوی تایبەتمەندی و جیاوازییەکانیەوە هەڵ بگیرێت بە ئامانجی کەمکردنەوەی ئەنجامدانی ئەم تاوانەو ڕێ لێگرتنی. لە پێشنیازەکانیشماندا ئاماژەی پێویست و گرنگ دەخەینە ڕووو ئاراستەی لایەنی پەیوەندیداریان دەکەین.

# پێشنیازەکان

١. یەکێک لە زەقترین ئەو ڕەخنەو پێشنیازانەی لەبارەی ئەم تاوانە لە یاسای سزادانی عێراقی پێویستە بخرێتە ڕوو بریتییە لەوەی پێویستە ئەم تاوانە شێوە نائەنقەستەکەشی لە سیاقی ماددە تایبەتەکانیدا زیاد بکرێت، چونکە تەنیا بارە ئەنقەستەکەی بە تاوان ئەژمار کراوە. ئەمە وای کردووە تەواوی حاڵەتەکانی لەباربردنی کۆرپەلە کە بە شێوەی نائەنقەست دێنە بوون، لە سزاو بەرپرسیارێتیی یاسایی قوتار ببێت و ڕێژەی ڕوودانیشی لە کۆمەڵگەدا بەرەو سەرەوە ببات، ئەوەش ئاشکرایە کە ئەم تاوانە وەک زۆرێک لە تاوانەکانی دیکە، ژمارەیەکی بەرفراوانی لە کۆمەڵگەدا بە شێوەی نائەنقەست ئەنجام دەدرێت. بۆیە بەهێنان و زیادکردنی بارە نائەنقەستەکەی و دانانی سزای گونجاو بۆی لە یاسای سزادانداا وا دەکات ڕێژەی ئەنجامدانی لە کۆمەڵگەدا کەم بکاتەوە.

٢. یەکێکی دیکە لەو پێشنیازانەی ئاماژەپێکردنی گرنگە، پەیوەندیدارە بە یاسای هاتوچۆی بەرکار لە هەرێمی کوردستان و پەیوەندیدار بە لەبارچوونی کۆرپەلەوە. ئەم یاسایە پێویستی بە هەموارکردن یاخود زیادکردنی ماددەیەک هەیە لەبارەی دانانی ڕێکارو بەرپرسیارێتیی سزایی بۆ ئەو حاڵەتە یان ڕووداوە هاتوچۆیانەی بە هۆیانەوە یەکێک یان زیاتر، لە قوربانیەکانی بریتی بێت لە کۆرپەلەیەک کە هێشتا لەدایک نەبووەو بە هۆیەوە لەبار دەچێت. چونکە لەبارچوونی منداڵان بە هۆی ئەو قوربانییە زۆرانەی بە هۆکاری ڕووداوەکانی هاتوچۆوە لە کوردستاندا دەکەونەوە بەرچاوە، تا ئێستایش لە

سیاقی ماددەکانی یاسای هاتوچۆداو لە یاسای سزادانیشدا هیچ پاراستنێکی یاساییان بۆ نەگیراوەتە بەرو مافیان هەروا بەهەدەر دەچێت.

٣. لەباربردن بە دەرمان یاخود لەباربردنی پزیشکی، یەکێکە لەو جۆرانەی لە دووتوێی زۆرێک لە یاسای سزادان و یاساکانی دیکەی وڵاتاندا ماددەی یاسایی و پایەیەکی تایبەتی بۆ دیار کراوە بە ئامانجی دەرخستنی ڕێکارو مەرجی تایبەتی هاتنەدی و دواجاریش ڕێگەپێدانی فەرمی لەلایەن دامودەزگا دادوەری و فەرمییەکانەوە، بۆ گیراوەتە بەر. یاسای سزادانی عێراقی لەم بارەوە لە سیاقی ماددەکانی تایبەت بە تاوانی لەباربردنی کۆرپەلە هیچ ئاماژەیەکی بە لەباربردن بە دەرمان یاخود یاسایی نەکردووە، بۆیە بە ناچاری بۆ پڕکردنەوەی ئەم کەلێنە پەنا بۆ ماددە ٦٣ی یاسای سزادان دەبرێت، ئەمەش وا دەکات زۆرێک لە حاڵەتەکانی لەباربردن بە بیانووی حاڵەتی پێویستی لە سزادان ڕزگار ببێت و بوار بۆ زۆرێک لە خەڵکان دەکرێتەوە خراپ سوود لەو ماددەیە وەر بگرن. بەڵام ئەگەر بێت و لە ماددەیەکی تایبەتداو بە شێوەیەکی پوخت ڕێکارو چۆنێتیی هاتنەدی و ڕێگەپێدانی لەباربردنی یاسایی ڕوون بکرایەتەوە، ئەوا ڕووبەڕووی هیچ کەلێن و گیروگرفتێکی یاسایی نەدەبووینەوە. لەبەر ئەوە زیادکردن و باسکردنی لەباربردن بە دەرمان بە ماددەیەکی تایبەت حاڵەتێکی پێویست و گرنگە.

٤. ئاشکرایە دانانی یاسا لە هەر وڵاتیکداو بەتاواندانانی کۆمەڵێک کردار لەلایەن یاسادانەرەوە تا ئاستێکی دیارکراو وا دەکات تاوان لە کۆمەڵگەدا سنووردار بکرێت، بەڵام ناتوانێت بە تەواوی کردارە تاوانکارییەکان لە کۆمەڵگەدا کۆتایی پێ بهێنێت. بۆ ئەوەی هەر

کردارێکی تاوانکاری، لە نێویشیاندا لەباربردنی کۆرپەلە، تا ئاستێکی باش لە کۆمەڵگەدا کەم بکرێتەوە پێویستە لە پاڵ ئەو ئەرکە گرنگەی یاسا هەیەتی سێکتەرەکانی دیکەی کۆمەڵگە هاوکارو هاوئاهەنگ بن تا بەو ئامانجە گرنگە بگەین. لەبەر ئەوەی لەباربردنی کۆرپەلە تاوانێکە لە بارودۆخێکی پەنهان و شاراوەدا ئەنجام دەدرێت، پێویستە تاکەکانی کۆمەڵگەو دامودەزگاکانی پۆلیس و داواکاری گشتی سەبارەت بە بوونی هەر جۆرە حاڵەت و زانیارییەک لەبارەی ڕوودانی ئەم تاوانە لە کۆمەڵگەدا چاوکراوەتر بن و بە زووترین کات بە ئەرکی یاسایی خۆیان هەستن و ڕێکارەکانیان بەرانبەر بگرنە بەر. جگە لەوەش، ئەو نەخۆشخانەو نۆڕینگە پزیشکییە فەرمی و نافەرمییانەی جۆرێک لە تایبەتمەندییان بە نەخۆشییەکانی ژنانی دووگیان و ئەنجامدانی لەباربردنی کۆرپەلە هەیە، بخرێنە ژێر چاودێریی وردو لە حاڵەتی سەرپێچیکردن و ئەنجامدانی تاوانی لەباربردندا لە دەرەوەی یاسا دا بخرێن.

٥. زیاتر هۆشیارکردنەوەو بە ئاگاهێنانەوەی تاکەکانی کۆمەڵگە بە تایبەت هاوسەران و چینی گەنجان، بۆ ئاشنابوون و سوودوەرگرتن لەو ئامرازو ڕێکارە پزیشکییانەی دەبنە مایەی ڕێگرتن لە دووگیانبوونی خانمان، بە تایبەتی کە هەر دوو لا نەیانەوێت ببنە خاوەنی منداڵ، تا ڕووبەڕووی حاڵەتی دووگیانیی نەخوازراو نەبنەوەو لە دواجاریشدا پەنا بۆ لەباربردنی کۆرپەلەکانیان نەبەن و بەرپرسیارێتیی یاساییان نەکەوێتە ئەستۆ.

٦. سەبارەت بە ئاستی سزای بڕیارلێدراو بۆ تاوانی لەباربردن لە یاسای سزادانی عێراقیدا، بە سەرنجدان لە ماددەکانی تایبەت بەم تاوانە، یاسادانەری عێراقی تا

ئاستێکی فراوان جیاوازیی کردووه له نێوان سزای بکەرێک کە بە ڕەزامەندیی خانمێکی دووگیان و بە بێ ڕەزامەندیی خانمەکە، کۆرپەلەکەی لەبار ببات. بەوەی لە حاڵەتی بوونی ڕەزامەندی سزای بکەری کەمتر لە ساڵێک بەندکردن دیار کردووەو، لە حاڵەتی نەبوونی ڕەزامەندی سزاکەی زیاد کردووه بۆ دە ساڵ زیندانیکردن. پێمان وایە ڕێژەی سزای بڕیارلێدراو بۆ ئەو دوو حاڵەتە ناهاوسەنگە، لەبەر ئەوە پێویستە جۆرێک لە هاوسەنگی بەرجەستە ببێت بە ڕێژەیەک کە سزای بکەری ئەم تانەوانە لە حاڵەتی بوونی ڕەزامەندیی خانمەکە زیاتر بکرێت، چونکە بوونی ڕەزامەندی لە بنچینەدا کرداری تاوانکاری ڕێگەپێدراو ناکات و نابێت بەو پانتاییە زۆرە کاریگەر بێت. جگە لەوەش بەشێکی گرنگ و کاریگەری فەلسەفەی بەتاواندانانی لەباربردنی کۆرپەلە پاراستنی ژیانی کۆرپەلەو بە تەندروست هێشتنەوەیەتی و مافی سروشتیی کۆمەڵگەشە لە زیادبوون و مانەوەی وەچەی مرۆڤایەتی.

هەر سەبارەت بە کێش و ڕێژەی سزا بۆ ئەم کردارە تاوانکارییە، پێشنیاز دەکەین یاسادانەر ئەو سزایەی لە بڕگە ٢ی مادده ٤١٧ بڕیاری لێ داوە بۆ بکەری ئەم تاوانە قورس بکات. چونکە بێجگە لە لەبارچوونی کۆرپەلە گیانی خانمە دووگیانەکەش لە دەست دەچێت، بۆیە قوربانی و ئەنجامی کردارە تاوانکارییەکە گەورەیەو پێویستی بە هاوسەنگی هەیە لە نێوان کردارو ئەنجامەکەیدا.

٧. بڵاوکردنەوەی هۆشیاری و زانیاریی پێویست لە ڕێگەی بەستنی کۆڕو سیمیناری تایبەت و سۆشیاڵ میدیاوە بە هەموو جۆرەکانیەوە بۆ خانمانی دووگیان سەبارەت بەو مەترسییە تەندروستییانەی لە ئەنجامی

لەبارچوونی کۆرپەلەکانیانەوە ڕووبەڕووی دەبنەوە. چونکە لە ئەنجامی ئەو لەبارچوونانەی ڕوو دەدەن، بەتایبەت ئەو لەباربردنانەی بە شێوەیەکی ناتەندروست لە دەرەوەی ڕێنماییە تەندروستییەکان ئەنجام دەدرێن، بێجگە لە قوربانیی سەرەکی کە کۆرپەلەکەیە، خانمانی دووگیانیش ڕووبەڕووی مەترسیی تەندروستی جەستەیی و دەروونی دەکاتەوە.

٨. بە هەماهەنگی لەگەڵ وەزارەتی ئەوقاف و یەکێتی زانایانی ئیسلامی، سەبارەت بەو کۆرپەلانەی کێشەی تەندروستییان هەیە یاخود ئەندامەکانی جەستەیان پێش لەدایکبوون تەواو نییەو شێواو (مُشَوَّه) ن، پێشنیازی سووککردنەوەی سزا دەکەین، لە پاڵ ئەو پاساوەی لە بڕگەی ٤ی ماددە ٤١٧ی یاسای سزاداندا بۆ سووککردنەوەی سزای سەر بکەری ئەم تاوانە هاتووە، تا لەباربردنی ئەم جۆرە کۆرپەلانەش بگرێتەوە.

# سەرچاوەكان

## كتێبەكان

یەكەم: كتێبە عەرەبییەكان


١. القرآن الكريم
٢. أسامة رمضان الغمري (٢٠٠٥)، أساسيات علم الطب الشرعي والسموم للهيئات القضائية والمحامين، دار الكتب القانونية، مصر.
٣. أكرم نشأت إبراهيم (١٩٩٨)، القواعد العامة في قانون العقوبات المقارن، ط١، مطبعة الفتيان، بغداد.
٤. الإمام الغزالي أبي حامد محمد، إحياء علوم الدين، دار الشعب، القاهرة.
٥. أمير فرج (٢٠٠٨)، أحكام المسؤولية عن الجرائم الطبية من الناحية الجنائية والمدنية والتأديبية للأطباء والمستشفيات والمهن المعاونة لهم، المكتب العربي الحديث، الإسكندرية، مصر.
٦. أميرة عدلى أمير عيسى خالد (٢٠٠٥)، الحماية الجنائية للجنين في ظل التقنينات المستحدثة، دار الفكر الجامعي، الإسكندرية، مصر.
٧. تافكة عباس البستاني (٢٠٠٥)، حماية المرأة في القانون الجنائي العراقي، ط١، مطبعة نازه، أربيل.
٨. جبرائيل البنا (١٩٤٨)، شرح قانون العقوبات/ القسم الخاص، مطبعة الرشيد، بغداد.
٩. حسين شيخ محمد الباليساني (١٩٨٨)، النظرية العامة لجريمة الامتناع، مطبعة الثقافة، اربيل.

١٠. حميد السعدي (١٩٧٦)، شرح قانون العقوبات الجديد، جرائم الاعتداء على الأشخاص، مطبعة المعارف، بغداد.
١١. رؤوف عبيد (١٩٧٤)، جرائم الإعتداء على الأشخاص والأموال، ط٦، دار الفكر الجامعي، مصر.
١٢. عباس الحسني (١٩٧٤)، شرح قانون العقوبات العراقي، القسم الخاص، ج٢، بغداد.
١٣. عبد الفتاح بيومي حجازي (٢٠٠٨)، المسؤولية الطبية بين الفقه والقضاء، ط١، دار الفكر الجامعي، مصر.
١٤. عبد الكريم زيدان (١٤١٥)، المفصل في أحكام المرأة والبيت المسلم، مؤسسة الرسالة، بيروت.
١٥. عبد النبي محمد محمود أبو العينين (٢٠٠٦)، الحماية الجنائية للجنين في ضوء التطورات العلمية الحديثة في الفقه الإسلامي والقانون الوضعي، دار الجامعة الجديدة للنشر، الاسكندرية، مصر.
١٦. علي حسين الخلف، سلطان عبد القادر الشاوي (٢٠١٠)، المبادئ العامة في قانون العقوبات، ط٢، العاتق لصناعة الكتاب، القاهرة.
١٧. عمر بن محمد بن إبراهيم غانم (٢٠٠١)، أحكام الجنائي في الفقه الإسلامي، ط١، دار ابن حزم، بيروت.
١٨. فوزية عبد الستار (١٩٨٢)، شرح القانون العقوبات، القسم الخاص، دار النهضة العربية، القاهرة.
١٩. لويس شمعان (١٩٧٣)، الطب العدلي التطبيقي، مطبعة الارشاد، بغداد.

٢٠. ماهر عبد شويش الدرة (١٩٩٧)، شرح قانون العقوبات، القسم الخاص، ط٢، الموصل.
٢١. ماهر عبد شويش الدرة (٢٠٠٨)، شرح قانون العقوبات، القسم الخاص، العاتق لصناعه الكتاب، القاهرة.
٢٢. محمد أمين ابن عابدين، حاشية ابن عابدين، ج ١-٣، مطبعة مصطفى الحلبي، القاهرة.
٢٣. محمد بن إبراهيم التويجري (٢٠١٦)، الفقه الإسلامي، دار أصداء المجتمع، السعودية.
٢٤. محمد بن أبو بكر الرازي (١٩٨٨)، مختار الصحاح، مكتبة لبنان.
٢٥. محمد صبحي نجم (٢٠٠٦)، شرح قانون العقوبات/ القسم الخاص، الطبعة السادسة، ديوان المطبوعات الجامعية، الجزائر.
٢٦. محمد نوري كاظم (١٩٧٧)، شرح قانون العقوبات، القسم الخاص، دار الحرية للطباعة، بغداد.
٢٧. محمود شلتوت (١٣٩٥)، الفتاوى دراسة مشكلات المسلم المعاصر، ط ٨، بيروت.
٢٨. مصطفى إبراهيم الزلمي (٢٠١١)، الإجهاض والتلقيح الصناعي وتحديد النسل، ط١.
٢٩. مصطفى إبراهيم الزلمي (٢٠١٣)، المسؤولية الجنائية في الشريعة والقانون، ط٣.
٣٠. مفتاح محمد اقزيط (٢٠٠٦)، الحماية المدنية والجنائية للجنين بين الفقه الإسلامي والقانون الوضعي، مصر، دار الكتب القانونية، المجلة الكبرى.
٣١. منيرة محمود الوتري (١٩٨٢)، المجموعة الأولى للبحوث القانونية والاجرامية على ضوء التحولات الاشتراكية، مطبعة الجامعة، بغداد.

٣٢.همداد محمد صابر (٢٠١٠)، الإجهاض كجريمة معاقب عليها قانونا، مطبعة مناره، اربيل.
٣٣.وصفي محمد علي (١٩٧٠)، الطب العدلي علماً وتطبيقاً، ط ٣، مطبعة معارف، بغداد.

## دووەم: کتێبە کوردییەکان

١. د. تەها عومەر ڕەشید (٢٠١٩)، یاسای هاتوچۆ/ شرۆڤەی تاوانەکانی هاتوچۆ لە ڕوانگەی فرەتاوانییەوە، چ١، چاپخانەی یادگار، سلێمانی.
٢. ماهر عبد شویش الدرة (٢٠٠٩)، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە بۆ کوردی (عبد الصمد محمد خەیلانی)، چ١، چاپخانەی منارە، هەولێر.

## سێیەم: کتێبە فارسییەکان

١. آخوندی، محمود (١٩٨٠)، آیین دادرسی کیفری، انتشارات وزارت فرهنگ و ارشاد اسلامی، ج١.
٢. اردبیلی، محمد علی (١٣٨٩)، حقوق جزای عمومی، ج١، چاپ ٢٤، میزان، تهران.
٣. اردبیلی، محمد علی (١٣٩٤)، حقوق جزای عمومی، ج٣، چاپ ۶، میزان، تهران.
۴. استیرو، کمپل (١٣٧٢)، معضلات اخلاقی در حرفه پزشکی، ترجمه جسن میانداری، چاپ١، معاونت امور فرهنگی، حقوق و مجلس وزارت بهداشت، درمان و آموزش پزشکی.
۵. آقائی‌نیا، حسین (١٣٩۴)، جرایم علیه اشخاص (جنایات)، چاپ١۴، میزان، تهران.
۶. پاد، ابراهیم (١٣۶٨)، حقوق کیفری اختصاصی، تهران، میزان.

۷. جعفری لنگرودی، محمد جعفر (۱۳۸۴)، ترمینولوژی حقوق، گنج دانش، چاپ ۲، تهران.
۸. حکمت، سعید (۱۳۶۶)، پزشکی قانونی، چاپ۲، انتشارات دانشگاه شهید بهشتی، تهران.
۹. رزم ساز، بابک (۱۳۷۹)، بررسی فقهی و حقوقی سقط جنین، چاپ ۱، تهران.
۱۰. سوهانیان، فاطمه (۱۳۸۹)، حمایت کیفری از جنین در حقوق ایران، ج۱، آذرخش، تهران.
۱۱. شومان، عباس (۱۳۹۴)، با ترجمه سالم افسری، احکام سقط جنین در فقه اسلامی، آراس، سنندج.
۱۲. طلعتی، محمد هادی (۱۳۸۳)، رشد جمعیت و تنظیم خانواده، چاپ ۱، انتشارات دفتر تبلیغات اسلامی حوزه علمیه، قم.
۱۳. عباسی، محمود (۱۳۸۲)، سقط جنین در تهران، حقوقی، تهران.
۱۴. گلدوزیان، ایرج (۱۳۷۶)، حقوق جزای اختصاصی، ج۱، چاپ۵، موسسه انتشارات جهاد دانشگاهی.
۱۵. لورانس لوترمی (۱۳۸۷)، با ترجمه محمود روح الامینی، حقوق کیفری عمومی فرانسه، میزان، تهران.
۱۶. محقق داماد، سید مصطفی (۱۳۷۹)، قواعد فقهۀ ج۱، چاپ۱، مرکز نشر علوم اسلامی، تهران.
۱۷. معاونت امور فرهنگی وزارت بهداشت، ۱۳۷۰، درمان و آموزش پزشکی، اخلاق پزشکی، چاپ۱.
۱۸. نوربها، رضا (۱۳۸۶)، زمینۀ حقوق جزای عمومی، چاپ۱۹، گنج دانش، تهران.

١٩. هكر، نويل (١٣٨۴)، بیماری زنان و مامایی، ترجمه‌ی سارا آرین مهر، انتشارات طبیب، تهران.

## بڵاوکراوەکان

### یەکەم: وتارو بڵاوکراوە عەرەبییەکان

١. محسن خرازي (١٤٢٠)، تحديد النسل والتعقيم، مجلة فقه أهل البيت، القسم٢، الرقم ١٥. مجلة العربي الكويتية (١٩٦٦)، العدد ١٧٧، الكويت.
٢. محمد عباس حمودي الزبيدي (٢٠١٠)، المصلحة محل الحماية في جريمة الإجهاض، مجلة الرافدين، ج ١٢، العدد ٤٣، الموصل.
٣. محمود الأمين (١٩٦١)، قوانين حامورابي صفة رائعة من حضارة وادي الرافدين، مجلة الآداب، الرقم ٣، بغداد.

### دووەم: بڵاوکراوە فارسییەکان

١. آقا بابایی، حسین (١٣٨۴)، گفتمان فقهی و جرمانگاري در حوزه جرایم علیه امنیت ملت و دولت، مجله فقه و حقوق، پژوهشگاه فرهنگ و اندیشه اسلامی، سال دوم، شماره ۵.
٢. آقایی، سید مجتبی (١٣٨۴)، سقط جنین در دین زردشت، فصلنامه باروری و ناباروری سال ششم، شماره ١۴، تهران.
٣. حسینی، سید هادی (١٣٨۴)، آزادی های فردی و بررسی تطبیقی حق سقط جنین در شماره ۵ استرالیا و ایران، مجله حقوق اساسی.

٤. رضا مهاجرين (١٣٧٨)، تولد اجبارى يا مرگ اختيارى (بررسى تبعات جرمانگارى و جرمزدايى از سقط جنين)، مجله تحقيقات حقوق خصوصى و كيفرى، شماره ١٠، تهران.
٥. محقق داماد، سيد مصطفى (١٣٧٣)، تحقيقى در مورد سقط جنين و عوارض ناشى از آن، مجموعه مقالات اخلاقى پزشكى، تهران.

## نامەی ماستەر

### یەكەم: نامە عەرەبییەكان

١. أحمد مصطفى علي مصطفى (٢٠٠١)، مسؤولية الصيدلاني الجزائية عن الأخطاء المهنية، رسالة ماجستير، كلية القانون، جامعة الموصل.
٢. جدوى محمد أمين (٢٠١٠)، جريمة الإجهاض بين الشريعة والقانون، رسالة ماجستير، جامعة أبوبكر بلعاد، قسم الحقوق، الجزائر.
٣. ضاري خليل محمود (١٩٧٧)، أثر رضا المجني عليها في القانون الجنائي المقارن، رسالة ماجستير، جامعة بغداد، قسم الحقوق، بغداد.

### دووەم: نامە فارسییەكان

١. طاهره، فرخى (١٣٩٤)، بررسى سقط جنين در حقوق كيفرى ايران و امارات متحده عربى، پايان نامه كارشناسى ارشد، دانشگاه آزاد اسلامى، واحد سنندج.
٢. مهدى، سودمند (١٣٨٧)، مطالعه تطبيقى جرم سقط جنين در مذاهب پنجگانه، پايان نامه كارشناسى ارشد، دانشگاه شهيد بهشتى.

## سەرچاوە ئینگلیزییەکان

Clayton, S. Q., Edward Arnold, U. K. (١٩٨٠), Obstetrics by Ten Teachers, ١٢th edition.

## ماڵپەڕە ئەلیکترۆنییەکان

١. www.jameataleman.org
٢. www.sehha.com
٣. www.falntyna.com
٤. www.fa.wikipedia.org
٥. www.mehrkhane.com
٦. www.chetor.com
٧. www.magiran.com
٨. www.kazemlaw.blogfa.com
٩. www.ghavanin.ir

# پێڕست

بەشی دووەم



بەشی سێیەم